


حکومەتی هەرێمی کوردستان - عێراق
وەزارەتی پەروەردە
بەڕێوەبەرایەتی گشتی پرۆگرام و چاپەمەنییەکان

# زمان و ئەدەبی کوردی






حکومەتی هەرێمی کوردستانی عێراق
وەزارەتی پەروەردە
بەڕێوەبەرایەتی گشتی پڕۆگرام و چاپەمەنییەکان

# زمان و ئەدەبی کوردی

## بۆ پۆلی دەیەمی ئامادەیی

دانانی
لیژنەیەك لە وەزارەتی پەروەردە

بژارکردن و پێداچوونەوەو داڕشتنەوەی

شێرکۆ احمد حوێز    محمد احمد محمد    محسن احمد کریم
فیصل مصطفی حاجی    المان احمد سلیم    وارتکیس موسیس
سکڤان جمیل محمد

چاپی سێیەم    ٢٧٠٩کوردی    ٢٠٠٩ز
چاپخانەی ئەکاسیا- هەولێر

**سەرپەرشتی زانستی: سادق ئەحمەد عوسمان**

**سەرپەرشتی هونەری چاپ: مهدی عباس قادر**

**عثمان پیرداود**

**نەخشەسازی بەرگ: عـــادل زرار**

**جێبەجێکردنی بژاری هونـــەری: زاگرۆس محمود عرب**

**تایپێست و نەخشەسازی ناوەوە: ڕابەر عەبدولواحید محەمەد**

# پێشدەستی

لێژنەکەمان، کە بە فەرمانی وەزارەتی پەروەردەی هەرێمی کوردستان پێکهاتووە، بەردەوامە لە بژارکردن و پێداچونەوەو دووبارە دارشتنەوەی پەرتوکەکانی زمان و ئەدەبی کوردی، هەردوو قۆناغی ناوەندی و ئامادەیی.

قورسایی کارەکەمان لەم پەرتووکەش دا خستە سەر هەردووبەشی ڕێزمان وئەدەب و ئەوەی بەپەسند زانرا بۆڕێکخستنەوەی پەرتووکەکە کرا، دیارە لەم پەرتووکەش دا ئەو ڕێبازەمان گرتەبەر کەلەمەو بەریش لەسەری دەرۆیشتین، ئەویش هێنانەوەی نموونەیە لە هەردوو زاری سەرەکی زمانی کوردی (کرمانجی ژووری و ژێری)، هەروەها زارەکانی تری کوردیشمان لەیاد نەکردووە.

پەرتووکی پۆلی چوارەمی ئامادەیی کراوە بەچەند تەوەرەیێك، یەکەمیان ڕێزمانە، کەبابەتەکان بەنموونەی تێکەڵ خراونەتە ڕوو، دەستووریان بۆ نووسراوەو ڕاهێنانیشیان بۆدانراوە، بۆیێ تکا لەسەر جەم مامۆستایانی بەڕێز دەکەین کە بە بایەخ و گرنکییەکی تەواو بابەتەکان بخوێنن و بەقوتابیانی بڵێن.

تەوەرەی دووەمی پەرتووکەکە، بەشی ئەدەبە، کەباسی ڕێبازی کلاسیزمە لەئەدەبیاتی کوردی، بەهەموو زارە سەرەکییەکانی، نموونەی زۆرمان هێناوەتەوە، هەرنموونەیەکیش ئەوبەشەی دەست نیشان کردووە کەبۆلەبەر کردنە، تکایە مامۆستایانی بەڕێز پابەند بن پێی. بەشی نموونەی ئەدەبیش، کەلەباسی چەند شاعیرێك پێکهاتووە، لەئەویش دا، هەوڵ دراوە هەموو لایەنێکی ژیان وبەرهەمی شاعیران ڕوون بکەینەوە، لەمیشدا دیسان دەست نیشانی ئەو برەکراوە کەبۆلەبەر کردن تەرخان کراوە، تکایە پابەندی بن.

دوا تەوەرەش، بەشی خوێندنەوەیە، کەپێویستە ئەم بەشەش گرنگی پێ بدرێت ونەخرێتە پشت گوێ و مامۆستایانی بەڕێز تادەتوانن بایەخی پێ بدەن.

دوا جاریش، داوا لەمامۆستایانی بەڕێز و بەئەمەکی زمان و ئەدەبی کوردی دەکەین کەبەهۆی بەڕێوەبەرایەتی گشتی پەروەردەی پارێزگەکانیانەوە ئاگادارمان بکەنەوە لەهەر کەم وکورتیو ناتەواوێك کەلەکاتی گوتنەوەدا هەستی پێدەکەن بۆئەوەی لەچاپەکانی داهاتوودا چاك بکرێنەوە، دیارە هیچ بەرهەمێکیش بێ کەم و کورتی نابێ.

خوای گەورەش پشت و پەنای هەمووان بێ
لیژنەی بژارکردن و پێداچوونەوەو
داڕشتنەوە

# ڕوونکردنەوە

وەزارەتی پەروەردەی حکومەتی یەکگرتووی هەرێمی کوردستان بە فەرمانی وەزاری ژمارە ١٤٥٧ لە ٨ / ٢ / ٢٠٠٧ لێژنەیەکی پێکهێنا بۆ یەکخستنەوەی پەرتووکەکانی زمان و ئەدەبی کوردی هەردوو قۆناغی ناوەندی و ئامادەیی لە سەرتاسەری قوتابخانە و خوێندنگەکانی هەرێمی کوردستان. لێژنەکە دەست بەکار بوو، هەردوو پەرتووکی زمان و ئەدەبی کوردی (ئیدارەی جارانی هەولێر و سلێمانی) کردە بنەمای ئەم یەکخستنە، بە لەبەرچاوگرتنی بە پێزیی و بەهێزیی بابەتەکانی ناو ئەم دوو پەرتووکە و لەئەنجامدا ئەم پەرتووکەی لێ کەوتەوە، کە بەشی هەرە زۆری هەردوو بەشی ڕێزمان و ئەدەبەکەی لەلایەن لێژنەیەکی پێشووتری دارشتنەوە و بژارکردنی ئەم دوو بەشە ئامادەکرابوو، لەبەرئەوە وا بە پەسند زانرا کە مافی ئەوانیشی بەسەرەوە بێت، هەروەرها ئاماژە بە سەرچاوەی ئەو بابەتە گۆڕاوانەش کراوە کە هاتوونەتە ناو پەرتووکەکەوە، بۆیە داوا لە مامۆستایانی خۆشەویستی بابەتی زمان و ئەدەبی کوردی دەکەین کە دڵسۆزانە پابەندی ناوەرۆکی ئەم پەرتووکە بن و هەر کەم و کورییەکی هەبێت بەهۆی پەروەردەکانی خۆیانەوە ئاگاداری بەڕێوەبەرایەتی گشتی پرۆگرامەکان بکەن لە وەزارەتی پەروەردە.

هیوادارین خوای گەورە هەموو لایەك سەربخات.

لێژنە

١٥ / ٤ / ٢٠٠٧

# بابەتەکانی بەشی ڕێزمان

## (ئامرازی بانگکردن)

**١- ئەی شەهیدان، نامریٚ ناو و نیشانتان**

**٢- باپیرە، دەستیٚك جلی كوردیم كڕی.**

**٣- خوشكینە، فیٚری زانست بن.**

**٤- هۆ برای كوردم، بەیەكگرتن سەردەكەوین.**

**٥- ئادەی هەڤالانی پیٚشمەرگە، هیٚرش ببەن.**

### خستنەڕوو:

ئەگەر تەماشای ڕستەكانی لای سەرەوە بكەین دەبینین:

١- لە ڕستەی یەكەمدا

ئـ- بیٚژەی (ئەی) پەیڤیٚكە دویٚنراوی پیٚ وریا كراوەتەوە كە (شەهیدان) ە لەبەر ئەوە پیٚی دەگوتریٚت (ئامرازی بانگكردن).

ب- وشەی (شەهیدان) بانگكراوە، چونكە ئەو ناوەیە كە وریا كراوەتەوە.

٢- لە ڕستەی دووەمدا

ئـ- بیٚژەی (ە) دویٚنراوی پیٚ وریا كراوەتەوە كە ناوی (باپیر)ە، لەبەرئەوە پیٚی دەگوتریٚت (ئامرازی بانگكردن).

ب- وشەی (باپیر) بانگكراوە، چونكە ئەو ناوەیە كە وریا كراوەتەوە.

٣- لە ڕستەی سیٚیەم دا، (خوشكینە، فیٚری زانست بن) كە بە واتای (ئەی خوشكان، فیٚری زانست بن) ە:-

ئـ- بێـژەی (ە) دوێنـراوی پـێ وریاکراوەتـەوە، لەبەرئـەوە پێـی دەگوترێـت ئامرازی بانگکردن وشەی (خوشکێن - خوشکان [1] بانگکراوە، چونکە ئەو ناوەیە کە وریا کراوەتەوە.

٤- لە ڕستەی چوارەمدا بێژەی (هۆ) وشەیەکە دوێنراوی پێ وریا کراوەتـەوە کە (برای کورد)ە لەبەرئەوە پێی دەگوترێت ئامرازی بانگکردن.

٥- لە ڕستەی پێنجەمدا

ئـ- بێـژەی (ئـادەی) پەیڤێکـە دوێنـراوی پـێ وریاکراوەتـەوە کـە (هـەڤالانی پێشمەرگە)یە، لەبەرئەوە پێی دەگوترێت ئامرازی بانگکردن.

ب- گرێـی (هـەڤالانی پێـشمەرگە) بـانگکراوە، چـونکە ئـەو ناوەیـە کـە وریـا کراوەتەوە.

٦- ئەگەر جارێکیدیکە سەیری ڕستەکانی سەرەوە بکەین و بەوردی سەرنجی ناوە بانگکراوەکان بدەین، دەبینین کە دەشێن ناوی بانگکراو: -

ئـ- تـەنها پـەیڤێك بێـت وەك لـە ڕسـتەی (یەکـەم و دووەم و سـێیەم)دا دەبینرێت.

ب- یان گرێیەك بێت وەك لە ڕستەی (چوارەم و پێنجەم) دا دەبینرێت.

**دەستوور:**

**١- ئـامرازی بـانگکردن:- ئـەو ئامرازەیـە کـە بـۆ بـانگکردن و وریاکردنەوەی کەسی دوێنراو بەکاردەهێنرێت.**

**٢- گرنگترین ئامرازی بانگکردن ئەمانەی خوارەوەن:**

**(ئەی ، هۆ، هەی، ێ، ە، ئادەی، ئا، ئۆ، هێ، ئەرێ)[1]**

---

[1] ناوێکی کۆ کە بەهۆی ئامرازی (ە) ی بانگکردنەوە وریا دەکرێتەوە، نیشانەی کۆی (ان) دەبێتە (ین).

## ڕاهێنان (١)

ئامرازی بانگکردن لەم ڕستانەی خوارەوە دەربهێنە.

١- ئەژدەهاك: ئەی دێوی لە (بیر) زراوچوو

ئەی ناشتای مارانت بەمێشك کردووە

٢- هەی سوار سواری، هەر تفەنگچی، دەست باتە تفەنگ

هەی ژنی جوان، ئارایشتی خۆی کا، بۆ ئاهەنگ

٣- نەسرین، ئەی ئەستێرەی بەیان،

ئەی جوان، ئەی شادەستەی جوانان

٤- هۆ مام بایز، وەرە بۆ ئێرە.

## ڕاهێنان (٢)

ئەم بۆشاییانەی خوارەوە بەم ئامرازانەی بانگکردن پڕبکەوە:-

(ئا ، ئادەی, ئەی، ئەها، ێ، ە)

١- .............. مانگ، من و تۆ هەردوو هاودەردین.

٢- .............. با بچین بۆ سەیری یارییەکە.

٣- پوور ..............، نانەکەت بخۆ.

٤- .............. کەپرەکە ڕووخا.

٥- کوڕ .............. بەسەر شۆستەکەدا بڕۆ.

---

[1] لە کرمانجی ژووروودا ئەم ئامرازانە بۆ بانگکردن بەکاردێن جگە لەو ئامرازە هاوبەشانەی سەرەوە:

ئۆ: بۆ نێر و مێ وەکو: ئۆ ئازاد ، بابێ تە هات.

ێ، هێ: هەردووکی بۆ مێ بەکاردێت وەکو – کچێ فێری زانست ببە.

ئۆ، هۆ: هەردووکی بۆ نێر بەکاردێت وەکو – هۆ شڤان پەزێ خۆ باش بچەرینە.

## ڕاهێنان (٣)

لەم ڕستانەی خوارەوەدا بانگکراوەکان دەربهێنە و جۆرەکانیان دیاری بکە:

١- ئەی نەوجەوانانی وەتەن، سا پێشکەون ئازا بڕۆن.

٢- خەڵکە من بۆ خوا، وا پێتان ئەڵێم

ئەمە وەسیەتە، وا من لەسەر ڕێم

٣- ئادەی ئاری ئەو گۆڤارەم بۆ بهێنە.

٤- خوشکێ ژ ئاخافتنا دایکا خۆ، دەرنەکەڤە.

٥- ئا کوڕی باش، ئەو پیاوەم بۆ بانگ بکە.

## (ئامرازی لێکدەر)

١- ئاشتی و دۆستایەتی، ئامانج و هیوای گەلانە.

٢- نە لە شار و نە لە دێ     نەمدی کەس وەك تۆ جوان بێ

٣- چەن بە ئاهەنگ، چەن سیحراوی!

ئەگەڕێ قاز یان مراوی

یان کۆتری حەوشی مزگەوت!

چەن خنجیلانەی لێ دێ ڕەوت!

٤- بەعسیە فاشستەکان، شار و شارۆچکە و گوند و مزگەوت و خوێندنگە و نەخۆشخانەکانی کوردستانیان کاولکرد.

٥- ئامانج نەهات بۆ کۆڕەکە، چونکە نەخۆشبوو.

### خستنەروو:

زۆر جار لە ئاخافتن و نووسیندا، لەبەر ڕەوانبێژی، یان لەبەر ئاسانی، یان بۆئەوەی ڕستە دووبارە نەکرێتەوە، دوو وشە یان دوو گرێ، یان دوو ڕستە، بەهۆی ئامرازێکەوە دەدەینە دەم یەك، بەو ئامرازانەی کە ئەم ئەرکە دەبینن دەڵێین: (ئامرازی لێکدەر).

لە ڕستەی یەکەمدا، لەجیاتی ئەوەی بە چەند ڕستەیەکی جیاواز بڵێین:

ئاشتی و دۆستایەتی هیوای گەلانە.

دۆستایەتی، هیوای گەلانە.

ئاشتی، ئامانج و هیوای گەلانە.

له لایەکەوە، وشەی (ئاشتی) و (دۆستایەتی)، لە لایەکی دیکەوە، وشەی (ئامانج) و (هیوا)مان، بەیاریدەی ئامرازی لێکدەرەوە کە بریتییە لە (و) داوەتە دەم یەك.

له هۆنراەکانی (گۆران) دا، لە لایەکەوە گرێی (نە لە شار)، لەگەڵ گرێی (نە لە دێ) دا، بەهۆی ئامرازی لێکدەری (و)ەوە دراونەتە دەم یەك، لە لایەکی دیکەوە، وشەی (قاز) و (مراوی) بەهۆی ئامرازی لێکدەری (یان)ەوە دراونەتە دەم یەك و لە لایەکی دیکەشەوە دێرە هۆنراوەی (یا کۆتری حەوش و مزگەوت ..... هتد) کە ڕستەیەکی وتاداری سەربەخۆیە، بەهۆی ئامرازی لێکدەری (یا)وە دراونەتە دەم دێرە هۆنراوەکانی پێشووی.

ئەرکی ئەو وشە، یان ئەو گرێیانەی کە بەم شێوەیە دەدرێنە دەم وشە یان گرێکانی پێشوویان، پێکەوە ئەرکێکیان هەیە، یان وەکو ئەرکی وشە یان گرێکانی پێشوویانن بۆنموونە:

لە ڕستەی یەکەمدا (ئاشتی و دۆستایەتی) گرێیەکی ناوییە و نیهادی ڕستەکەن.

لە ڕستەی دووەمدا (نە لە شار) و (نە لە دێ) هەردووکیان گرێی هاوڵکارین و هەردووکیان تەواوکەری کارن.

لە ڕستەی سێیەمدا دەستەواژەی (قاز یان مراوی) گرێیەکی ناویە و بکەری ڕستەکەیە.

لە ڕستەکەیە چوارەمدا دەستەواژەی (شار و شارۆچکە و گوند و مزگەوت و خوێندنگە و نەخۆشخانە) گرێیەکی ناویە و بەرکارە.

ڕستەی پێنجەم لە دوو ڕستەی سادە پێکهاتووە و بەهۆی ئامرازی لێکدەری (چونکە) دراونەتە دەم یەك.

**دەستوور:**

**ئامرازی لێکدەرئەو بێژەیەیە کە دوو وشە یان گرێ یان دوو ڕستە، بەیەکەوە دەبەستێت، هەریەکەیان بۆ گەلێك مەبەستی جیاواز بەکاردێن.**

**ئامرازی لێکدەر لە زمانی کوردیدا زۆرن، لەوانە:-**

**(کە، و ، تا، یان، بەلاّم، یاخود، کەچی، جگە، بێجگە، لەگەڵ، نەك ، نەوەك، مەگەر، لەدواییدا، لەپاشدا، .........هتد).**

## ڕاهێنان (١)

ئەم بۆشاییانەی خوارەوە بە ئامرازی لێکدەری گونجاو پڕبکەوە.

١- خوشك ............. براکە، مەڕەکانیان لە داوێنی چیاکەدا دەلەوەڕاند.

٢- سەهۆڵ ............ گەرم بکرێت، جارێکی دیکە دەبێتە بە ئاو.

٣- من لێرە، ناجووڵێم ............ ئەوان نەیێنەوە.

٤- ئەوان لە ئیشەکەی خۆیان بوونەوە ............ ئێوە هێشتا هەر لە ماڵەوەن.

٥- سێوەکەم بۆ هەڵبگرە ............. هەنارەکە.

٦- ............. منداڵەکە دەگریا دایکی شیری بۆ ئامادە دەکرد.

٧- بڕۆن ............ ئێوارێ، زوو بێنەوە.

## ڕاهێنان (٢)

لەم ڕستانەی خوارەوەدا ئامرازی لێکدەر دەربهێنە.

١- پیرەمێرد دەڵێت:

لە دەربەندیخان هەتا کەلیخان
ئەو ناوە یەکسەر شێواوە و وێران
شیوو هەردو بەر تا لووتکەی بەرزان
پڕ لە وەیشوومە، بە گەڵا ڕێزان

٢- ئەگەر لە زستاندا بەفر و باران نەبارێت بەنداوەکان ئاویان کەم دەبێت.

٣- کارزان لەگەڵ هاوڕێکانیدا زۆر کۆشش دەکات، چونکە دەترسێت، کە لە تاقیکردنەوەکاندا دەرنەچێت.

٤- بێکەس دەڵێت:

ئەمڕۆ زەمانی عیلم و عیرفانــــــە
عالەم شەو و ڕۆژ وا لە فرمانــــــە
فەرقی نێر و مێ نییە بیـــــــزانە
هەستە، تێکۆشە تا خوێنت گەرمە
سەرپۆش فڕێدە چ وادەی شەرمـە

## ڕاهێنان (٣)

بەهۆی ئامرازی لێکدەرەوە سێ گرێ دروست بکە لە ڕستەدا بەکاریان بهێنە، بەمەرجێك ببنە:-

١- بکەر ٢- بەرکار ٣- تەواوکەری بەیاریدەی کار

## ڕاهێنان (٤)

لەم ڕستانەی خوارەوە ئامرازی پەیوەندی، لێکدەر، بانگکردن جیابکەوە:

١- کە زۆر هات، قەواڵە بەتاڵە.

٢- کوردینە، یەکبگرن.

٣- ئاسۆ نەبەز، لەدوای ئێمەوە گەیشتنە هەولێر.

٤- ئەی خوێندکاری ژیر، لە وانەکانتدا کۆشش بکە.

٥- حەمدی دەڵێت:

کە ڕۆیشتی بەجارێ دڵ و جەرگ و هەناوم کەوت

کەچوویتە (تانە) تانە سەر گلێنەی هەردوو چاوم کەوت

ئەڵێن هاتوویتە (کوێت) بڵێ قوربانی کوێتی کەم

کە نۆبەت بەر سەری نەحسی شکاوی بێ کڵاوم کەوت

## ڕاهێنان (٥)

ئەم ڕستانە شی بکەوە:

١- تا ئارەق نەڕێژیت، شیرینی ناچێژیت.

٢- بە پەلە هاتم، کەچی ئاری ڕۆیشتبوو.

## (جێناوی لێکدەری (کە ، کو))

**ئەم ڕستانە بخوێنەوە:**

**١- ئەم شارە کەشەقامی زۆرە، جوانە.**

**٢- کوردایەتی کەئەڤینێکی گەورەو بەهێزە، مانای بەرگرییە لەخاك ونەتەوەی کورد.**

**٣- ڕەواندز کەپایتەختی میرنشینی سۆران بوو، شارێکی خۆش ودڵگیرە.**

**٤- ئەو مامۆستایەی کەپێشمەرگەبوو، شەهیدکرا.**

**٥- ئەو خورتێن کوژبۆ میللەتی دخەبتن، سەرفرازن.**

**٦- ئەو کچا کو دچیتە دهۆکێ، دۆستا وەیە.**

**٧- ئەڤـ کتێبا کو لسەر مێزێیە، یامنە.**

**خستنە ڕوو:**

ڕستەکانی سەرەوە، هەر یەکەیان لە دوو ڕستەی سادە یا زیاتر پێکهاتوون، بەڵام ڕستەکان لێکدراون و بوونەتە یەك ڕستە، ئەو لێکدانەش بە یارمەتی پەیڤێك بوو کە پێی دەڵێن جێناوی لێکدەر . جێناوی لێکدەریش یان( کە) یان(کو) بۆیەش پێی دەگوترێت جێناوی لێکدەر، چونکە لە هەر ڕستەیەك لەم ڕستانە لەجیاتی ناوی کەسێك یان شتێك بەکارهاتووە کە لە پێشدا گوترابێت، دوو ڕستەش پێکەوە گرێدەدات بەزۆریش دەکەوێتە دوای ئەو ناوەی کە لە ڕستەی دووەم دا جێی دەگرێتەوە، لە ڕستەکەشد جێناوی لێکدەر هیچ ئەرکێکی تر نابینێت.

١- له ڕستەی یەکەم دا، کە ڕستەیەکی ئاوێتەیە و پێشتر دوو ڕستە بووە کە هەر یەکەیان ڕستەیەکی سادە بووە :

**ئـ - ئەم شارە جوانە.**

**ب - ئەم شارە شەقامی زۆرە.**

کە هەر یەك لەم ڕستە سادانە، لە نیهادو کارێکی ناتەواوو تەواوکەر پێکهاتووە، بەڵام کە دراونەتە پاڵ یەك بۆئەوەی ڕستەیەکی ئاوێتەیان لێ پێك بهێنین، ئەوا هاتوین لە جیاتی پەیڤەکانی"ئەم شارە"، کە ناوێکی گشتی دەست نیشان کراوە بە یارمەتی هاوەڵناوی نیشانەی (ئەم-ە)، بەڵام چونکە دوو ڕستەکەشی لە یەکتر داوە ئەوا ناومان لێناوە "جێناوی لێکدەر".

٢- لە ڕستەی دووەمیش دا، کە پێشتر لە دوو ڕستەی سادە پێکهاتبوو :

**ئـ- کوردایەتی مانای بەرگری یە لە خاك و نەتەوەی کورد.**

**ب- کوردایەتی ئەڤینێکی گەورەو بەهێزە.**

هەریەك لەم ڕستانەش لە نیهادو کارێکی ناتەواوو تەواوکەر پێکهاتووە. بەڵام ئێمە هاتووین لە جیاتی دووبارە کردنەوەی پەیڤی "کوردایەتی" کە ناوێکی واتاییە پەیڤی"کە" مان بەکارهێناوە، کە جێناوی لێکدەرە، چونکە دوو ڕستە سادەکەی لێکداوە.

٣- هەر بەم جۆرە، لە ڕستەی سێیەمیش دا کەلە دوو ڕستەی سادەی

ئـ- ڕەواندز پایتەختی میرنشینی سۆران بوو.

ب- ڕەواندز شارێکی خۆش و دڵگیرە "ڕەواندز" مان لابردووە لە جیاتی ئەو پەیڤە "کە" مان بەکارهێناوە کە جێناوی لێکدەرە.

٤- ڕستەی چوارەمیش هەر بەو جۆرە.

٥- له ڕستەی پێنجەمیش دا، کە ڕستەیەکی ئاوێتەیەو پێشتر له دوو ڕستەی ساد پیکهاتووه:

١- ئەو خورت سەرفرازن

٢- ئەو خورت ژبۆ میللەتی دخەبتن.

هەردوو ڕستەکە دراونەتە پـالْ یـەك بۆئـەوەی ڕسـتەیەکی ئاوێتـەیان لێ پێك بێت، لەجیاتی وشەی(ئەو خورتێن)ی رستەی دووەم، کـەناوێکی دەسـت نیـشانکراوه، پـەیڤی"کـو"مـان بـەکار هێنایـەو جێـی گرتووەتەوه،هەروەسـا دوورستەکەشی لێکداوه. ژبەر هەندێ دبێژینێ"جێناوی لێکدەر".

٦- لەرسـتەی شەشـەم دا، کەرسـتەیەکی ئاوێتەیـەو پێـشتر لـەم دووڕسـتە سادەیە پێکهاتبوو

١- ئەو کچ دۆستا وەیە.

٢- ئەو کچ دچیتە دهۆکێ.

لەجیاتی پەیڤی(ئـەو کـچ) لەڕسـتەی دووەم دا،وشـەی (کـو) بـەکار هـاتووەو جێی گرتووەتەوه ودوو رستەکەشی لێکداوه،ژبـەر هنـدێ دبێـژینێ (جێنـاوی لێکدەر).

٧- ڕستەی حەفتـەمیش، کەرسـتەیەکی ئاوێتەیـە لەدووڕسـتەی سـادە پێـك دێت.

١- ئەڤـــ کتێب یامنە.

٢- ئەڤـــ کتێب ل سەر مێزێ یە.

لەجیاتی پەیڤی "ئەڤ کتێب" لەرستەی دووەم دا، وشەی "کو" بەکارهاتووەو جێی گرتووتـەوه، هـەروەها دوو رسـتەکەی لێکدایـە، بۆیـێ پێـی دەگوترێـت جێناوی لێکدەر.

**دەستوور:**

**١- جێناوی لێکدەر ئەو پەیڤەیە کە لە جیاتی ناوی کەسێك یان شتێك بەکاردەهێنرێت کە پێشتر گوترابێت، هەروەها دوو ڕستەش پێکەوە گرێ دەدات و لە ڕستەیەکدا ڕێکیان دەخات.**

**٢- جێناوە لێکدەرەکان ئەمانەن : کە، کو**

**٣- بە زۆری جێناوی لێکدەر دەکەوێتە دوای ئەو ناوەوە کە لە ڕستەی دووەم جێی دەگرێتەوە:**

## ڕاهێنان ( ١ )

ئەو ڕستانە دیاری بکە کە جێناوە لێکدەرەکان پێکەوەی بەستوون:

١- ئەو کەسەی کە منداڵی خۆی باش پەروەردە دەکات نیشتمان پەروەرە.

٢- ئەو ڕەزێ کو تە کێلای، یێ بابێ منە.

٣- مامۆستایان کە ڕەنجی فێرکردن پێشکەش بە هاونیشتمانیان دەکەن پێشەوای گەلن.

١- ئەڤ پارێ کو تو بەلاڤ دکەی، سامانێ میللەتیە.

٢- ئەو مامۆستایێ کو وەدیتی، پسپۆڕێ ئەندازێیە.

٣- کوردستانی عیراق کە بە خوێنی شەهیدان ئازاد کرا، پێشکەوتووە.

## ڕاهێنان( ٢ )

ڤان ڕستان شلۆڤە بکە :

١- ئەو خوێندکارێ کو مە دوهی دیتی، خارزایێ تەیە.

٢- ئەو گەلەی کە بە ئازادی بژیت، سەرفرازە.

## (ڕستەی ئاوێتە)

ئەم ڕستانە بخوێنەوە:

١- کەرکوك کە لە مێژوودا بە "ئارابخا"ناوبراوە، شارێکی کوردستانە

٢- نەت زانیوە کە چیرۆکی مەم و زین بە شاکاری خانی دادەنرێت؟

٣- ئەو هۆزانێن کو تە ژبەرکرین، گەلەك خۆشن.

٤- نەت بیستووە کە هێز لە یەکگرتن دایە؟

٥- تە نەبیستییە، کو دلۆڤانیێ خوێندنا خۆ تەواو کریە.

### خستنە ڕوو:

هەریەك لەم ڕستانەی سەرەوە لە بنچینەدا لە دوو ڕستەی سادەی سەربەخۆ پێکهاتووە کە پاشان بە یارمەتی جێناوی لێکدەر، یان ئامرازی لێکدەری "کە"و"کو" لێکدراون و بوونەتە ڕستەیەکی ئاوێتە، ڕستەکانیش کە لێکدراون، یەکێکیان ڕستەی سەرەکییە کە پێی دەگوترێت "شارستە"کە ڕستەیەکی بنجی و سەربەخۆیە لە ڕووی واتاوە، وشەی لێکدەریشی پێش نەکەوتووە، بەڵام ڕستەیەکی تریشی تێدایە کە پارستەیە کە ڕستەیەکە لە ڕووی واتاوە سەربەخۆ نییە، ئەو بەشەیە کە جێناوی لێکدەر یا ئامرازی لێکدەری پێش دەکەوێت، سەر بە شارستەکەیە، بۆ نموونە لە ڕستەی یەکەم دا کە ڕستەیەکی ئاوێتەیە "کەرکوك شارێکی کوردستانە " شارستەیە بەڵام "کە لە مێژوودا بە ئارابخا ناوبراوە" پارچە ڕستەیەکی سەربەخۆو سەرەکی نییە، بەڵکو سەر بە شارستەکەیە، دیارە جێناوی لێکدەری (کە)ی کەوتۆتە پێشییێ بۆیە دەتوانین بە ئاسانی (پارستە)لە (شارستە) جیا بکەینەوە، دیارە چ پارستەکە یان شارستەکە هەر یەکەو(کاری) خۆی هەیە، بەم پێیە ڕستەی ئاوێتەچەند کاری تێدا بێت ئەوەندە پارستەو شارستەی تێدا دەبێت.

**دەستوور:**

١- ڕستەی ئاوێتە لە دوو ڕستەی سادە یان پتر پێکدێت، بە یاریدەی وشەی لێکدەر (جێناوی لێکدەر، ئامرازی لێکدەر)ی (کە،کو)دەدرێنە پالْ یەکتر.

٢- لە ڕستەی ئاوێتە دا ئەو بەشەی کە بنجی و سەربەخۆیە پێی دەگوترێت "شارستە "بەلاّم ئەو بەشەی کە بنجی نییە و واتای بەستراوە بە واتای شارستەکەوە پێی دەگوترێت "پارستە"

٣- وشەی لێکدەر لە ڕستەی ئاوێتەدا هەمیشە دەکەوێتە پێش "پارستە"وە، لەبەرئەوە بە سانایی دەتوانین لە ڕستەی ئاوێتەدا، شارستە لە پارستە جیا بکەینەوە.

٤- ژمارەی کارێن ڕستەی ئاوێتە، ژمارەی بەشێن وێ دەردخەن، واتە لە ڕستەی ئاوێتەدا، چەند (کار) هەبن ئەوەندە بەشە ڕستە ژی دەبن.

٥- وشەی لێکدەر یان دەبێتە "جێناوی لێکدەر"یان "ئامرازی لێکدەر" ئەگەر لە بڕی ناوێك یان جێناوێك بەکارهات ئەوا جێناوی لێکدەرە، وەك ئەڤ کتێبا کو لسەر مێزێ یە یا هەڤالێ منە.

بەلاّم ئەگەر دوو ڕستان لێك بدات ئەوا دەبێتە ئامرازی لێکدەرو جێی هیچ ناوێك ناگرێتەوە وەك :

نەت بیستووە کە هەولێر پایتەختی هەرێمی کوردستانی عیراقە.

## ڕاهێنان ( ١ )

ئەمانە لە ڕستەی ئاوێتە بەکار بێنە:

١- کە شاعیرێکی مەزن بوو.

٢- کە کوردستان ئاوەدان دەکەنەوە.

٣- کو تە فرۆشتی.

٤- کە تۆ دیوتە.

٥- کو سالار ب دویڤ زانستیٚ دگەڕێت.

٦- کو حکومەتا هەرێما کوردستانیٚ پرۆژێن مەزن ڤەدکەت.

٧- کە گوندێکی خۆش بوو.

## ڕاهێنان ( ٢ )

وشەی "کە" و"کو" هەریەکەیان لەدوو ڕستەدا بەکاربهێنە بەمەرجێك جارێك جێناوی لێکدەرو جارێکیش ئامرازی لێکدەر بن.

## ڕاهێنان ( ٣ )

ئەم بۆشاییانە بەجۆرێك پڕبکەوە کەڕستەی ئاوێتەیان لیٚ پێك بێت.

١- من بیستییە،..................

٢- ئەم دزانین......................

٣- گۆران..............لەهەڵەبجە لەدایك بووە.

٤- هەڵەبجە کە..............شارێکی گەورەی کوردستان بوو.

٥- ئەوەی کە نیشتمان پەروەر بێت.................. .

## ڕاهێنان ( ٤ )

ئەم ڕستانە شلۆڤە بکە (شی بکەوە):

١- ئەو کوردەی کەخەباتی کردووە، شایانی ڕێزلێنانە.

٢- ئەو تۆلاّزێ کو دوهی هاتی، پسمامێ تە بوو.

## (دروستكردنی ناوی واتایی)

١- كاكی برا هۆ كاكی كورد
لە هەركویێ هەی شەنی یاگرد
وەرە تۆزیێ گوێی پیاوەتی
شل كە بۆ لای كوردایەتـــی

(كامل ژیر)

٢-

ئ- جاران پەنـاگـەی شەوانــم
ئامێزی ئاوەلأی ژن بـــوو
گەرمی و نەرمی ئەو ئامێزە
مایەی حەسانەوەی من بوو

(هێمن)

ب-كوشتم تەب داخا دوو چاڤا
تیـــركو بـــەردا بـــوو هنـاڤا
نەشـــیام ئـەز باڤێـم دوو گـاڤا
ژ كـــویـری و ســـارییـا بـرینێ

(تاهرێ روشدی)

٣- هەر لە زاخۆ هەتا كرماشان
پرسەیە ،ماتەمە ، بەخۆدادان
لە مەهاباد هەتا سلێمانـــی
ناڵە ناڵە لەباتی گۆرانـــــی

(گۆران)

٤- ڕەفتارت زۆر شیرینە
كردارت زۆر ڕەنگینە
دیدارت مایەی ژینـــە
دووریت كول و برینـــە

(شێركۆ ئەحمەد)

٥- مخابن بۆجهیٚ کوردا
نهۆلیٚ بویه ئیٚڤاریٚ
هەتائەڤرۆ دخەو دامان
بسەر داهات شەڤا تاری

**خستنە ڕوو:**

لە بەرنامەکانی سالأنی پێشوودا و لە بابەتی دابەشکردنی ناو لە ڕووی هەبونەوە، زانیمان کە ناوی واتایی دوو جۆرە، جۆری یەکەم ئەو ناوانەن کە لە بنجدا ناوی واتایین، دەستکردو دروستکراونین وەك ناوەکانی، شەرم، هۆش، هێز. جۆری دووەم ئەو ناوە واتاییانەن کە دەستکردو دروستکراون و ئەم دروست کردنەش بە پێی دەستوورو بنەمای تایبەتیەوە بەرێوەدەچێت. جا بۆ ڕوونکردنەوەی چۆنیەتی دروستکردنی ناوی واتایی، ئەگەر سەیرێکی نموونەکان بکەین دەبینین:

١- لە دوو دێرە هۆنراوەی یەکەم دا، دوو ناوی واتایی دروستکراوهەن، (پیاوەتی)و(کوردایەتی) ئەم دوو ناوە بوونی سەربەخۆیان نییە، تەنیا لە بیرو هزردا هەستیان پیٚ دەکرێت، یەکەمیان لە ناوی (پیاو)و پاشگری (ەتی) دووەمیشیان لە ناوی (کورد) و پاشگری(ایەتی) دروستکراوە.

٢- لەدوو دێرە هۆنراوەی ژمارە (٢)ی لقی(ب)دا، دیسان دووناوی واتایی (گەرمی)و(نەرمی)بەرچاو دەکەون، ئەڤ دووناوەژی ژ(هاوەلناو)وپاشگری (ی) هاتینە دروستکردن.

لەپارچە هۆنراوەی لقی (ب)ش دا، دووناوی (کویری-قوولی)و(ساری-ساردی)هەن،کەهەردووکیان ناوی واتایین ولە(هاوەلناو)و پاشگری(ی)هاتینە دروستکردن.

٣- ئەگەر دێڕە هۆنراوەکانی ژمارە (٣) بخوێنینەوە، دەبینین هەردووناوی واتایی (پرسە) و(ناڵە)، بەپێی یەك دەستوور دروستکراون، کەئەو ژی بریتییە لەڕەگی کار لەگەڵ پاشگری (ە)، چونکە (پرسە) لەڕەگی کاری چاوگی (پرسین)و(ناڵە)ش لەڕەگی کاری چاوگی (ناڵین)، لەگەڵ پاشگری (ە) هاتینە دروستکردن.

٤- هەروەها لەدێڕە هۆنراوەکانی ژمارە چواریش دا، ناوە واتاییە دروستکراوەکانی (ڕەفتار، کردار، دیدار) لە قەدی چاوگ وپاشگری (ار) دروست کراون.

٥- هەروەها لەدێڕە هۆنراوەکانی ژمارە(٥)یش دا، ناوی واتایی(خەو) بەرچاو دەکەوێت، کەڕەگی کاری چاوگی (خەوتن)ەو هەرخۆشی بووە بە ناوی واتایی.

**دەستوور:**

**ناوی واتایی، ناوێکە خۆی لەخۆیدا بوونی سەربەخۆیی نییە، بەڵکو لە هزرو خەیاڵدا پەیدا دەبێت، ئەم جۆرە ناوەش دەکرێت بە:**

**ئ- ناوی واتایی بنجی: کەهەر خۆی لەبنەڕەتدا ناوێکی واتاییە.**

**ب- ناوی واتایی دەستکرد(دروستکراو): بەم جۆرە دهێتە دروستکردن.**

**١- ناو لەگەڵ پاشگرێك، بەزۆریش پاشگرە بەکار هاتووەکان ئەمانەن،**

**(ی ، ەتی ، یەتی ، ایەتی ، ێتی ، ینی ، اتی ، یی ).**

**٢- هاوەڵناو لەگەڵ پاشگرێك: پاشگرەکانیش بەزۆری ئەمانەن،**

**(ی ، یەتی، (ێتی)،(ایی، ە، اتی، ا)**

ئەم پاشگرانەش دەخرێنە سەر:

ئـ- هاوەڵناوی چۆنی وەك: ڕەشی، باشی، بڵندی.

ب- هاوەڵناوی بکەری داڕێژراو وەك:نووسەری، سەرپەرشتیاری، دانایی، زانایی.

پ- هاوەڵناوی بکەری لێکدراو وەك: گەشبینی، گیانبازی.

٣- ڕەگی کار لەگەڵ پاشگری (ە) وەك: پرسە.

٤- جاری وا هەیە ڕەگی کار خۆی دەبێتە ناوی واتایی وەك:خەو،جەنگ،ڕەنج.

٥- قەدی چاوگ لەگەڵ پاشگری (ار) وەك: کردار- مردار (مرار).

٦- هەموو چاوگەکان وەکو ناوی واتایی بەکار دێن.

٧- ناوی واتایی، وەکو هەرناوێکی تر، دەبێتە(نیهاد، بکەر، بەرکار، تەواوکەری یان (دیارخەری) ناو، تەواوکەری بەیاریدە، تەواو کەری کاری ناتەواو).

## ڕاهێنان ( ١ )

لەم دێڕە هۆنراوانەدا، ناوە واتاییە دروستکراوەکان دەست نیشان بکەو جۆری دروستکردنەکەشیان دیاری بکە :

١-بە منداڵیی لە لێوی ئاڵی تۆم ئەستاندوە ماچێ
بە پیریش لەززەتی ئەوماچە شیرینەم لە بیر ناچێ

٢- لێ هیڤی دکەم ژ موستە عیدان
حەرفان نەگرن ژ موستە فیدان
ئەڤ نامە ئەگەر خراپە گەر قەنج
کێشایە مە دگەل وی دووسەد ڕەنج

٣- جوامێر و هیمەت و سەخاوەت
مێرینی و غیرەت و جەلادەت
ئەو خەتمە ژبۆ قەبیل ئەكراد
وان دانە بە شێرو هیمەت و داد

## ڕاهێنان ( ٢ )

ئەم ناوە واتاییە دروستكراوانە، چۆن دروستكراون ، دەستووری دروستكردنیان بنووسە:

خۆشەویستی،كرێتیی، كۆخە، برسییەتی، تەقە، دۆستاتی، مرۆڤینی كوڕێنی، گەرما.

## ڕاهێنان ( ٣ )

وەڵامی ئەم پرسیارانە بدەوە:

١- جیاوازی لە نێوان ناوی بەرجەستەو ناوی واتایی چییە؟

٢- پێنج چاوگی دەنگی بهێنەوەو ناوی واتاییان لێ دروست بكە.

## ڕاهێنان ( ٤ )

لەم ڕستانەدا، ئەو پەیڤەی هێڵی بەژێردا كێشراوە شلۆڤەی بكە:

١- زانایی سەرچاوەی كامەرانییە.

٢- كار بە ناڵەو گریە چارەسەرناكرێت.

٣- ئەم كێشەیە ئارامی دەوێت.

٤- ئاخافتنا زۆر بۆ مرۆڤی كرێتییە.

# (هاوەڵناوی ژمارەیی)

## ١- هاوەڵناوی ژمارەیی بنجی

١- ئەم نموونانە بخوێنەوە

خاڵۆ خاڵۆتەن کەم واچە خاڵــــۆ

خاڵۆ دەم وەبان خالاٚنت مـــــاڵۆ

شەرت بۆمن جەداخ خاڵۆ خاڵۆی تۆ

خۆم کەرۆ وەکوڕ چواردە ساڵەی نۆ (مەولەوی)

٢- بیست و حەوت ساڵە من ڕەنجبەری تۆم

بە نان و ئاوو جل و بەرگی خـــــۆم

خزمەتم کردی لە ئێـــــــــران و ڕۆم (بێکەس)

٣- دلبەرێ ئیرۆ سەحەر ئاڤێتە جەرگێ من دوو دۆخ

یەك لسینە یەك لدلدا لەو ژمن تێن ئاخ و ئۆخ (مەلای جزیری)

٤- تا فەلەك دەوری نەدا سەد کەوکەبی ئاوا نەبوو

کەوکەبی ماهی موبارەك تالعی پەیدا نەبـــوو (نالی)

٥- هەزار ئەفسوون و جادووی پێوە ئاوێزانە ئەم ڕیشە

عیلاجی گەر ببێ یا گوزە یا گوێزانەئەم ڕیشە (شێخ ڕەزا)

٦- سێ چوار قوتابی لە پۆلەکەمان دا زیرەکن.

## خستنە ڕوو:

ئەگەر ئەم نموونانە بخوێنینەوە دەبینین لە:

١- لە نموونەی یەکەم دا هاوەڵناوێکی ژمارەیی بەکارهاتووە کەوتۆتە پێش ناوی (ساڵ)ەوە، بەم جۆرە هاوەڵناوەکە وەسفی ناوی ساڵ دەکات و سنوورێك بۆ ژمارەی ئەو ساڵانە دادەنێت کە چواردە ساڵن . هەروەها ئەگەر وردتر تەماشای نێو دێڕە هۆنراوەکە بکەین دەبینین هاوەڵناوی (چواردە) بەبێ یاریدە لە پێش ناوەکە دانراوە.

٢- لە نموونەی دووەمیش دا هاوەڵناوی ژمارەیی (بیست و حەوت) کە هاوەڵناوێکی ژمارەیی لێکدراوە لە دوو هاوەڵناوی ژمارەیی سادە دروست بووە. یەکەمیان بیست و، دووەمیشیان حەوت ، ئەم دوو هاوەڵناوە ژی بە ئامرازی (و) هاتینە لێکدان، دیسان ژی لەپێش ناوی (ساڵ) دانراوە بۆئەوەی وەسفی ناوەکەی پێبکەین وسنوورێك بۆ ژمارەی ساڵەکان دابنرێت، ئەم هاوەڵناوەش هەر بەبێ یارمەتی لەپێش ناوەکە دانراوە.

٣- لە نموونەی سێیەمیش دا هاوەڵناوە ژمارەییەکانی (دوو) و (یەك) کەهەر یەکەیان خراونەتە بەر دەمی ناوێکەوە بۆ ئەوەی وەسفی ناوەکەیان پێ بکرێت و دەست نیشانی ژمارەی ئەو (دۆخ) انەی پێ بکرێت کەلەسینەو دڵییان داوە، واتە سنوورێك بۆ ژمارەی ناوەکە دانراوە، ئەم کارەش بەبێ یارمەتی کراوە.

٤- لە نموونەی ژمارە چواریش دا دیسان دەبینین هاوەڵناوی (سەد) بەبێ یاریدە لەبەر دەم ناوی (کەوکەب) دانراوە بۆئەوەی دەست نیشانی ژمارەی کەو کەبەکان بکات و وەسفی ناوەکەشی پێ بکرێت.

٥- هەروەها لەنموونەی پێنجەمیش دا هاوەڵناوی ژمارەیی (هەزار) بەبێ یاریدە لەبەر دەم ناوی لێکدراوی (ئەفسوون وجادوو) دانراوە.

بۆئەوەی دەست نیشانی ژمارەیان بکات و وەسفیشیان بکات.

٦- لەرستەی شەشەم دا هاوەڵناوی (سێ چوار)لەپێش ناوی قوتابی دانراوەو بەبێ یاریدە وەسفی ناوەکەی پێکراوەو سنوورێکی داناوە بۆ ژمارەی قوتابییەکان، بەڵام چونکە گومان لەژمارەکە هەیە بۆیی لەنیوانیان دا هیچ ئامرازێکمان دانەناوە.

**دەستوور:**

**هاوەڵناوی ژمارەیی بنجی، هاوەڵناوێکە ناوەکەی دوای خۆی واتە ناوە تەواو کراوەکەی بەژمارە دەست نیشان دەکات وسنورێك بۆ ژمارەکەی دادەنێت.**

**١- ئەو ناوەی لە دوای هاوەڵناوە ژمارەییە بنجییەکەوە دێت، سادە بێت یان نادادە، دەبێت تاك بێت. بەڵام کە دەگوترێت منداڵە چواردەساڵانەکە. ئەوا (چواردە ساڵان) دەبێتە گرێی هاوەڵناویی . یان (بە شەش ڕۆژان کارەکەم تەواوکرد) ئەوا (شەش ڕۆژان) گرێی هاوەڵکارییە.**

**٢- هاوەڵناوی ژمارەیی بنجی بەبێ یاریدە دەخرێتە پێش ناوە تەواوکراوەکەوە، بەڵام ئەگەر (ی) ئامرازی دانەپاڵ خرایە نێوانیان ئەو کاتە هەردووکیان پێکەوەدەبنە گرێی هاوەڵکاری کاتی وەك:**

**شۆڕشی کورد لە یازدەی ئەیلوول دا بەرپابوو.**

که لێرەدا (لە یازدەی ئەیلوول) گرێیەکی هاوەڵکاریە ، یان دەتوانین بڵێین وەك ژمارەی ڕێکخستنی لێ دێت و ئەم شێوەیەش بەزۆری لەگەڵ مانگەکان دا بەکاردێت.

٣- ئەگەر دوو ژمارە بەدوای یەکەوە هاتن و گومان لە ژمارەکە هەبوو ئەوا لە نێوانیاندا ئامرازی (و)ناهێتە دانان وەك:

پێنج شەش سێوم خواردن . کەلێرەدا ژمارەکە گومانی لێ دەکرێت چونکە لەوانەیە زیاتر یان کەمتر بێت لە(پێنج شەش)

٤- هەرسێ هاوەڵناوی ژمارەیی بنجی (هەشت، نۆ، دە) پێکەوە دێن بەبێ ئامراز بۆ نموونە دەگوترێت (هەشت نۆ دەپیاوهاتن)

٥- لەژمارە بیست بەولاوە کەگومان لەژمارەکە بکرێت سەرەگرێیەکان دەگوترێن وەك:

بیست سی کەس هاتن.

چل پەنجا قوتابی دەرچوون.

٦- ژمارە (دە) و دەجارەکانی (سەد، هەزار،.......هتد) دەکرێت نیشانەی کۆیان بخرێتە سەر و بگوترێت:

دەیان پێشمەرگە شەهید کران.

سەدان ئوتومبێل لەوێستگەدا وەستاون.

ب هەزاران کورد هاتنە کیمیا باران کرن.

٧- هەر کاتێك بمانەوێت بڕی شتێك دەست نیشان بکەین وشەیەك دەهێنین کەئەو بڕە دەست نیشان بکات ولەدوای ژمارەکەوە بەکاری دەهێنین وناوە ژمێراوەکەی پێ دەکەین بەناوێکی لێکدراو، وەك:

سێ کیلۆ شەکرم کــــڕی.

پێنج جەواڵ گەنمی بۆناردم.

هەندێك لەم پەیڤانەش بریتین لە:

ئـ- نەفەر ← بۆمرۆڤ پێنج نەفەر کەبابمان کڕی.

ب- سەر ← بۆئاژەڵ هەشت سەر بزنم هەیـــە.

پ- دەست ← بۆجلك ونوێن دوودەستە نوێن وچوار دەستە جلکم بۆ نارد

ت- بەرگ ← بۆ پەرتووك سێ بەرگ پەرتووکی ڕێزمانم کڕی.

ج- چاوە ← بۆژوور خانووەکەمان سێ چاوەی هەیە.

چ- پارچە ← بۆزەوی سەد پارچە زەوی بەسەر مامۆستایان دا دابەشکران.

ح- بن، بنە ← بۆدار و درەخت شەش بنەدارم بڕی.من شەش بنێن دارا بڕین.

خ- دانە ← بۆشتی ژمێراو دوودانە قەڵەمم لەم جۆرە هەیە

د- جووت ← بۆپێڵاو وگۆرەوی سێ جووت پێڵاوم هەیە.

٨- پەیڤی(ئەوەندە- هەندە) هاوەڵناوی ژمارەیی نادیارەو لەسێ تا نۆ دەگەیەنێت وەك:

بیست وئەوەندە ساڵە تۆم نەدیوە.

پەنجاو ئەوەندە ساڵە بەرلەئێستا بێکەسی شاعیر کۆچی دوایی کرد

٩- ژمارەی بنجی سادەلە (یەك)ەوە دەست پێدەکات تا (نۆ).بەژمارەکانی (دە، بیست، سی، وچل و.........هتد) دەگوترێت

(سەرەگرێ) .

١٠- ژمارەی بنجی لێکدراویش بەم جۆرە پێك دێت :

ئـ- لەدوو ژمارەی بنجی تێکەڵ وەك : یازدە، دوازدە، هەژدە

ب- لەدووژمارەی بنجی سادە، یان زیاتر کەبەهۆی ئامرازی (و) درابنە دەم یەکتر وەك :

بیست ودوو، چل وشەش، سەد وچل و پێنج .

پ- لە دوو ژمارەی بنجی سادە بەبێ یارمەتی ئامرازی (و) درابنە دەم یەکتری وەك:

چوار پێنج ، شەش حەفت.

ت- بەهۆی بەکارهێنانی پەیقی دەست نیشان کردنی بڕی ناوەکە کە دەخرێتە پێش ناوەکەوە وەك:

دووسەر مەڕم هەیە .

کەلێرەدا (دووسەر) دەبێتە ژمارەیەکی بنجی لێکدراو.

١١- ئەگەر دووژمارەی بنجی لەیەك خانەدابن (یەکان، دەیان، بیستان، سییان.........هتد)، ناوە ژمێراوەکە دەکەوێتە دوای هەردووکیانەوە وەك چار پێنج مرۆڤ هاتن (چار، پێنج، لەخانەی یەکانن)
چل ودوو چل وسێ کچ لەم قوتابخانەدا دەخوێنن. (هەردووکیان خانەی چلانن)
بەلآم ئەگەر دووژمارە بنجییەکە لەیەك خانەدا نەبن وهەریەکەیان سەربەخانەیەکی جیاواز بێت ئەواپێوستە لەدوای هەریەکەیان ناوەژمێراوەکە باس بکرێت وەك:

نۆزدەپیاو بیست پیاودەبوون :ڕەوانیە بگوترێت :نۆزدە بیست پیاو دەبوون .سی ونۆ کەس چل کەس کوژران. ڕەوانیە بگوترێت سی ونۆ چل کەس کوژران.[1]

---

[1] گەلێك جاریش لەتوانا دا هەیە بگوترێت نەه دەه زەلام هاتن یان نۆدەپیاو هاتن بەلآم ئەم جۆرە دەربڕینە زۆر دروست وڕاست نیە، ڕاستییەکەی ئەوەیە بگوترێت نەه زەلام دەه زەلام هاتن.

**تێبینی:**

ژمارەی بنجی لەگەڵ وشەی تردا بەکاردێن وئەوکاتە هاوەڵناوی لێکدراو دروست دەکەن وەك:

| | |
|---|---|
| مانگی چواردەشەوە | (چواردەشەوە) |
| گندۆرەی سێ مانگی | (سێ مانگ) |
| منداڵی یەك ساڵە | (یەك ساڵە) |
| ئاوی دووشەوە | (دووشەوە) |

## ڕاهێنان (١)

ئەم بۆشاییانە بەپەیڤێکی گونجاو پڕبکەوە:

١- حەفت.......... جلکم بۆخوشکەکانم کڕی.

٢- هەزار......... پەرتووك بۆپەرتووکخانەی قوتابخانەکەمان بەدیاری هات.

٣- ئەڤرۆ من سێ......... بزن بازاڕی کرین.

٤- باخچەوانەکە شەش.......... درەختی سێوی چاند.

٥- مام پیرۆتی دوو........... زەڤی لەگوندێ مەهەنە.

## ڕاهێنان (٢)

لەم رستانەدا هەر پەیڤێك کەهێڵی بەژێردا هاتووە شلۆڤەی بکە:

١- دوهی ئازادی سێ دانە قەڵەم کڕین.

٢- من بیست برادەرو تۆ یازدە برادەرت هەن.

٣- وێ چارپێنج خانی ل دهۆکێ فرۆتن.

٤- هەزاران سەرباز لەجەنگ دا بەشدار بوون.

٥- وان دوو کاڤرێن قەلەو ڤەکوشتن.

## ڕاهێنان ( ٣ )

١- جیاوازی لەنێوان ژمارەی بنجی لێکدراو بەهۆی ئامرازێکی لێکدەر و ژمارەی لێکدراو بەبێ ئامرازی لێکدەر چییە؟ بەنموونەوە ڕوونی بکەوە.

٢- جیاوازی لەنێوان پەیڤە هێڵ بەژێر داهاتووەکانی ئەم دوو ڕستەیە چییە؟

ئ- لەڕۆژی پێنجی ئاداردا گەلی کورد ڕاپەڕی.

ب- تەمەنی لەزگینی برام پێنج ساڵە.

## (هاوەڵناوی ژمارەیی)

## ٢- هاوەڵناوی ژمارەیی ڕێکخستن

ئەم نموونانە بخوێنەوە:

ئ- قوتابی یەکەم هەموو ساڵێك لە لایەن وەزارەتی پەروەردە خەلات دەکرێت.

ب- یەکەم قوتابی هەموو ساڵێك لە لایەن وەزارەتی پەروەردەوە خەلات دەکرێت .

پ- قوتابییا ئێکێ(یەکێ) هەمی سالان ژ لایێ وەزارەتا پەروەردێ ڤە دهێتە خەلات کرن.

٢-

ئ- ئەندازیاری سێیەم دەرچووی زانکۆی دهۆکە.

ب-سێیەم ئەندازیار دەرچووی زانکۆی دهۆکە.

پ- ئەندازیارێ (ئەندازیارا) سێێ ژ زانکۆیا دهۆکێ دەرچوویە.

٣-

ئ- دووەمین (دووهەمین) کۆنگرەی مامۆستایانی کورد لە ساڵی ١٩٦٠ز لە شەقلاوە گرێدرا.

ب- کۆنگرێ دوویێ یێ مامۆستایێن کورد ل سالا ١٩٦٠ز ل شەقلاوە هاتە گرێدان.

٤-

ئ- لە دەیەمین ساڵیادی ڕاپەڕینی گەلی کوردستانا هەزاران سلاو بۆ گیانی پاکی شەهیدان.

**ب- ل ساڵیادا دەیێ (دەهێ) ڕاپەڕینا گەلێ کوردستانێ هەزاران سلاڤ بۆ گیانێ شەهیدان.**

**-٥**

**ئ- سەدو بیست و دووەم (دووەمین) کەس لە دانیشتوان برای منە.**

**ب- کە سێ سەدوبیست و دوویێ ژ ڕونیشتییان برایێ منە.**

**خستنە ڕوو:**

ئەگەر سەرنجێك لە ڕستەکانی سەرەوە بدەین دەبینین :

١- لە ڕستەی ژمارە(١) ی (ئـ) دا، ژمارەی بنجی (یەك) مان لە شێوەی هاوەڵناوێکی ژمارەیی بەکارهێناوە بۆ ئەوەی پلەو خانەی ئەو قوتابییەی پێ دەست نیشان بکەین کە هەموو ساڵێك لە لایەن وەزارەتی پەروەردە خەلاَت دەکرێت، هاوەڵناوەکەمان خستۆتە دوای ناوی( قوتابی)یەوە لە نێوانیاندا (ی) ئامرازی دانە پاڵمان بەکارهێناوە ، بەڵام لە ڕستەی (ب)دا ئەم ئامرازە بەکارنەهاتووە چونکە ناوە ژمێراوەکە کەوتووەتە دووای هاوەڵناوە ژمارەییەکەوە. هەر لە هەمان ڕستەی ژمارە (١) ی (پ) داو بۆ هەمان مەبەست، لەگەڵ ژمارە (ئێك - یەك) کە هاوەڵناوێکی ژمارەیی بنجییە ، پاشگری (ێ) مان بەکارهێناوە هەر بۆ مەبەستی دەرخستنی پلەو خانەی قوتابییەکە و لە نێوان قوتابی و هاوەڵناوە ژمارەییەکەش دا پیتی (ا،ێ)وەکو ئامرازی دانەپاڵ بەکارهاتوون (ا) بۆ ڕەگەزی مێ و (ێ) بۆ نێر پیتی (ی) کە کەوتۆتە نێوان دوا پیتی پەیڤی (قوتابی) و (ا،ێ)ی ئامرازی دانە پاڵ بووە بە (یا، یێ) کە ئەگەر ڕستەکە جارێکی تر ناوی قوتابی تیادا دووبارە بکرێتەوە ئەوا ئەم (یا، یێ)یە جێی ناوی قوتابی دەگرێتەوە ، بۆ نموونە دەتوانین بڵێین :

١- قوتابییا ئێکێ هاته خەلات کرن ویا (ئا) دوویێ نەهاته خەلات کرن.

٢- خوێندکارێ ئێکێ هاته خەلات کرن ویێ (ئێ) دوویێ نەهاته خەلات کرن.

کە دیارە لێرەدا نەمان ویستووە ناوی قوتابی دووبارە بکەینەوە بۆیێ (یا - ئا) (یێ - ئێ) لە شوێنی دا بەکارهاتووە, لەم جۆرە ڕستانەشدا هەمیشە ناوەکە لەپێشەوە دێت و هاوەڵناوەکە لە دوایەوە, ناکرێت شوێنەکانیان بگۆڕین.

٢- لە ڕستەی ژمارە(٢) ی (ئـ) دا، هەربەشێوەی پێشووهاوەڵناوی ژمارەیی بنجی (سێ) مان کرد بەسێیەم کەهاوەڵناوەکی ژمارەیی ڕێکخستنە بۆئەوەی پلەی ئەندازیارەکەی پێ دەست نیشان بکەین، لەدوای ناوی ئەندازیارەوە بەکارهاتووە، بۆیی (ی) وەکو ئامرازی دانەپاڵ خراوەتە نێوانیان وچونکە هاوەڵناوی(سێ) کۆتایی بەبزوێن دێت بۆیی کەپاشگری (ە م) دەخەینە سەری پێویستمان بەناوبەندێك دەبێت لەنێوان هەردوو بزوێنی (ێ)ی دوای (سێ) و (ە)ی پاشگری (ەم) ودەبێتە سێیەم (سێ یەم) لەرستەی (ب) ئامرازی دانەپاڵ لەنێوان ناوەکەو هاوەڵناوە ژمارەییەکە بەکارنەهاتووە چونکە ئەمجارەیان هاوەڵناوەکە پێشکەوتووە.

ئنجا لەرستەی ژمارە دووی (پ)دا، دەبینین ناوی ئەندازیار لەپێشەوە هاتووە وهاوەڵناوە ژمارەییەکەش لەهاوەڵناوی ژمارەیی بنجی (سێ) وپاشگری (ێ- ا) دروست بووەو، بووە بە (ئەندازیارێ(ئەندازیارا)سێیێ) کەپلەی ئەندازیارەکە دەست نیشان دەکات- جائەگەر رستەکە دووبارە کردنەوەی ناوی ئەندازیاری تێدابوو،ئەوا لەجیاتی ناو هێنانەکە یان(یێ- ئێ) یان (یا - ئا) بەکار دەهێنین ودەڵێین: ئەندازیارێ سێیێ ل زانکۆیا دهۆکێ دەرچوویە و یێ (ئێ) چارێ ل

زانكۆيا سلێمانییێ (بۆنێر).

ئەندازیارا سێییێ ل زانكۆیا دهۆكێ دەرچوویەو یا (ئا) چارێ ل زانكۆیا سلێمانییێ (بۆمێ).

٣- لەرستەی ژمارە (٣)ی (ئـ) دا هاوەڵناوی ژمارەیی ڕێكخستنی(دووەمین- دووهەمین) لەپێش ناوی (كۆنگرە)ەوە بەكارهاتووە بۆدەست نیشانكردنی پلەی كۆنگرەكە، ئەم هاوەڵناوە، بەم شێوەیەی كەدروست بووە، پەسند وایە هەردەم لەپێش ژمێراوەكەوە بێت،

واتە ، بۆنموونە، ئەگەر بگوترێت :

((پێنجەمین خانووماڵی ئێمەیە)) پەسند ترە لەوەی بگوترێت:

((خانووی پێنجەمین ماڵی ئێمەیە))

چونكە ئەگەر ناوە ژمێراوەكە بكەوێتە پێش، پەسند وایە ئەو كاتە هاوەڵناوی ژمارەیی ڕێكخستنەكە بەهۆی پاشگری (ەم- هەم) دروست بكرێت وبگوترێت:

خانووی پێنجەم ماڵی ئێمەیە.

لەڕستەی (ب) دا، هەربەهۆی پاشگری (ی)وە، هاوەڵناوی بنجی (دوو) كراوە بەهاوەڵناوی ڕێكخستن . دیسان ئەگەر لەرستەكەدا ناوەژمێراوەكە دووبارە كرایەوە، پێویست ناكات ناوی بهێنین بەڵكو بەهۆی (یا- ئا) دەست نیشانی دەكەین ودەڵێین:

كۆنگرێ دوویێ مامۆستایێن كورد ل سالا ١٩٦٠ ز و (یێ) ئێكێ ل سالا ١٩٥٩ ز ل شەقلاوە هاتە گرێدان .كەدیارە لێرەدا (یێ-ئێ)شوێنی ناوی كۆنگرەیان گرتووەتەوە.

٤- لەرستەکانی (ئـ) و(ب)ی ژمارە (٤) یش دا، هەردوو هاوەڵنـاوی ژمـارەیی ڕێکخـستنی (دەیـەمین) و دەیـیٚ(دەهـیٚ) بـۆ هـەمان مەبەسـتی دەسـت نیشانکردنی پلەی ساڵیادی ڕاپەرینی گەلی کوردستان بەکار هاتوون.

یەکەمیان بەهۆی پاشگری (ەمین) کراوە بەو جۆرە هاوەڵناوەو لەپێش نـاوی (سـاڵیاد)دا دانـراوە کەئـەویٚ شـوێنی سروشـتی خۆیـەتی و، چـونکە ژمـارە بنجییەکە (دە) کۆتایی بەبزوێنی (ە) هـاتووە، بۆیـە کـە پاشـگری (ەمـین)ی دەخرێتـە سـەر ،کەئـەویش بـەبزوێنی (ە) دەسـت پێـدەکات ، ناچـار دەبـین ناوبڕێك لەنێوان ئەو دوو بزوێنەدا دابنـێین کـە(ی) یـەو پاشـگرەکە ئـەو کاتـە لەشێوەی (یەمین) دەردەکەوێت (دەیەمین).

٥- لەرستەی ژمـارە (٥)دا، هاوەڵنـاوی ژمـارەیی ڕێکخـستنی (سـەدو بیـست ودووەم ((دووەمـــین)) لێکـــدراوەو ژمارەکـــان بـــەهۆی ئـــامرازی (و)ی پەیوەندییەوە لێکدراون ونیشانەی (ەم) یان (ەمین) دەچێتە سەر دواژمـارە، واتە دوا ژمارە نیشانەی ڕێکخستن وەردەگرێت.

**دەستوور:**

**١- هاوەڵناوی ژمارەیی ڕێکخستن ،بەوهاوەڵناوە دەگوترێـت کەپلـەی ژمێراوەکانی خۆی (واتە ئەو شتە هاو ڕەگەزانەی کەدەیان ژمێرێت) بەشێوەی ڕێکخستن یان ریز بەندی رادەگەیەنێت.**

**ئەگـەر هاوەڵنـاوە ژمارەییەکـەی ڕێکخـستن لـەدوای نـاوەوە هـات ئـەوا پێویـستی بـە(ی) ئـامرازی دانـە پـاڵ دەبێـت وئەگیناپێویـستی پێـی نابێت.**

**٢- ئـەو هاوەڵنـاوە بنجییانـەی کـەکۆتاییان بـەپیتی نـەبزوێن دێـت هەریەکـسەر بـەهۆی پاشـگری (ەم- هـەم) و (ەمـین)- (هـەمین) ەوە دەکرێن بەهاوەڵناوی ڕێکخستن ، بەڵام ئەگەر ژمارە بنجییەکە کۆتـایی**

بەبزوێنـەکانی (ێ، ا، ۆ، ە، ی) بێـت، ناچـار دەبـین لـەنێوان ژمارەکـەو نیـشانەکەدا (ی) ناوبەنـد دابنـێین لـەو ژمـارە بنجییانـەی کـەکۆتاییان دێت بەبزوێنی (وو) ناوبەندە کە دەبێتـە (و)، بزوێنـی (وو) ی کۆتـایی وشەکە لەباری ئاسایی خۆی کەمێك کورت تر دەگوترێت.

٣- لەشێوەی زاری کرمانجی ژوورو دا هاوەڵناوی ژمارەیی ڕێکخستن بە هۆی پاشگری (ێ،ا) دروست دەکرێت، کە دەخرێتـە کۆتـایی ژمـارە بنجییەکـەوە، ئەگـەر ژمارەکـە کۆتـایی بـە بزوێنـەکانی (أ،ێ،ۆ،ە،ی) هاتبوو ، ناوبڕی (ی)لە نێوان ژمارەکەو نیشانەکەدا دادەنێن وئەگـەر ژمارە بنجییەکەش کۆتایی بەبزوێنی (وو) هاتبوو ناوبەندەکە دەبێتـە (و)، بزوێنی (وو)ی کۆتایی وشەکە لـەباری ئاسـایی کـەمێك کـورت تـر دەگوترێت.

٤- لەشێوەی زاری کرمانجی ژوورودا هاوەڵنـاوی ژمـارەیی ڕێکخستن هەمیـشە دەکەوێتـە دوای ناوەکـەوە، بۆدانـە پـالیش یائـامرازی (أ) بۆرەگەزی (مێ) و یان ئامرازی(ێ) بۆرەگەزی نێر بـەکاردێت و، ئەگـەر ناوە ژمێراوەکە لەڕستەیەك دا دووبارە بکرێتەوە بەڵام بەئاشکرا ناوی نەهێنین ئەوا بۆ ڕەگەزی مێ (یا- ئا) و بۆ ڕەگەزی نێریش (یـێ- ئـێ) بەکاردێت، ناوە ژمێراوەکەش هەمیشە تاکە .

٥- نـابێ لـەجیاتی هاوەڵنـاوی ژمـارەیی ڕێکخـستن ،هاوەڵنـاوی ژمارەیی بنجی بەکاربهێنین بەمەبەستی دەربڕینی واتـای یەکـەمیان، واتە ناکرێ بڵێین : سەدەی دوو لەجیاتی سەدەی دووەم

٦- ئەگـەر هاوەڵنـاوی ژمـارەیی ڕێکخستن بـەهۆی پاشـگری (ەمین- هـەمین)ەوە دروسـت بـوو، واپەسـند تـرە کەهەمیـشە لـەپێش نـاوە ژمێراوەکـە بێـت، ئەگـەر بەدواشییەوە بێت هەردورستە، بـەڵام ئەگـەر بەهۆی پاشگری (ەم- هەم)ەوە دروست کرابوو، پەسند وایـە بکەوێتـە دوای ناوەکەوە، خۆئەگەر ل پێشییاوی ژی بێت هەردروستە.

## (هاوەڵناوی ژمارەیی)

## ٣- هاوەڵناوی ژمارەیی کەرتی

١-

ئ- سێیەکی مەڕەکانی خۆمم فرۆشت.

ب- سێیەکا(سیٚ ئێکا)پەزێن خۆمن فرۆتن.

٢- ئ- $\frac{٢}{٨}$ دوو هەشت یەکی بەرهەمی ئەم کارگەیە بۆ هەژارانە.

ب- دوو هەشت یەکا بەرهەمیٚ ڤیٚ کارگەهیٚ بۆ هەژارانە

٣- ئ- $\frac{٣}{٢٠}$ سیٚ بیست یەکی خوێنکاران لە تاقیکردنەوەی ڕێزمانی کوردی دا دەرنەچوون.

ب- سیٚ بیستیەکا خوێندکاران ل تاقیکردنەوا ڕێزمانیٚ کوردی دەرنەچوون.

---

(١) سێکا ژی دهێتە گۆتن.

(٢) دوو هەشتێکا ژی دهێتە گۆتن.

(٣) سیٚ بیستێکا ژی دهێتە گۆتن.

٤-

ئـ- ٣٥٪ لـه سـەدا (ن) سـی و پێنجـی کرێکـارانی ئـەم کارگەیـە نەخوێندەوارن.

ب- ژ سەدا (ن) سە وپێنج کرێکارێن ڤێ کارگەهێ نەخویندەڤانن.

٥-

ئـ- ٠,٧ له دەیا (ن) حەفتی کچانی قوتابخانەکەمان خەڵکی دهۆکن.

ب- ژ دەیا حەفتێ کچێن قوتابخانە مە خەلکی دهۆکێنە.

٦-

ئـ- ٠,١٤ له سەدا چواردەی مامۆستایان ئوتومبێلی خۆیان هەیە.

ب- ژ سەدا (ن) چاردە مامۆستا خودانێ ئوتومبێلا خۆنە.

٧-

ئـ- ٠,٢٤٧ له هەزاران دووسەدو چل وحەفتی سەربازان له جەنگ کوژران.

ب- ژ هەزاران دووسەدو چل و حەفت سەرباز ل جەنگێ هاتنە کوشتن.

٨-

ئـ- $\frac{١}{٢}$ نیوەی پارەکەم لێ بزر بوو.

ب- نیڤەکا پارێ من بەزر بوو.[٤]

---

[٤](نیڤا) ژی دروستە

**خستنەڕوو:**

لە خوێندنەوەی ڕستەکانی سەرەوەدا بۆمان دەردەکەوێت کە لە هەر ڕستەیەکیاندا هاوەڵناوێکی ژمارەیی هەیە کە وردەی ناوە ژمێراوەکەی دوای خۆی نیشان دەدات وئەندازەی کەرتەکە ڕادەگەیەنێت.

١- لە ڕستەی ژمارە یەکی (ئـ)دا هاوەڵناوی ژمارەیی (سێیەك) ئەندازەی مەڕە فرۆشراوەکان پیشان دەدات و لە دوو ژمارەی بنجی(سێ) و (یەك) پێکهاتووە کە بە یاریدەی (ی) ئامرازی دانەپاڵەوە کاری خۆی کردووە. ئەم جۆرە پێکهاتنەش تەنیا لەو جۆرە ژمارانەدا دەبێت کە ژمارەی دووەمیان (یەك)بێت، وەك چواریەك ،شەشیەك ، هەشتیەك.

لە هەمان ڕستەی ژمارە یەك و لە بەشی (ب)دا ، هاوەڵناوی ژمارەیی (سێیەکا) یان (سێ ئێکیا) ئەندازا ڤان پەزان دەردێخیت کۆ ژلایێ مـن ڤە هاتینە فرۆتن، ئەڤ هـژمارا کەرتییە ژی پێکهاتیە ژ هـژمار بنجییا (سێ) و(ئێك- یێك) دیساژی ئەڤ جۆرە پێکهاتنە هەر دڤان هژمارا دبیتن کو هـژمارا دوویێ ژوان (ئێك- یێك) بیتن وەکی (چارئێك- چارییێك) (شەش ئێك- شەشییێك) (حەفت ئێك- حەفتییێك) و ب هاریکارییا (ا) یان (ێ) ی ئامرازێ دانەپاڵ کارێ خۆ دکەتن.

٢- لە ڕستەی دووەمیش دا ئەو هاوەڵناوە ژمارەییە کەرتییەی کە ئەندازەی ئەو بەرهەمە دەردەخات کە بۆ هەژاران تەرخان کراوە هاوەڵناوی (دوو هەشت یەك)ە کەلە ژمارە بنجییەکانی(دوو, هەشت, یەك) پێکهاتووە و بە هۆی ئامرازی (ی) دانەپاڵەوە کاری پیشاندانی ئەندازەی تەرخانکراوی بەرهەمەکە دەست نیشان دەکات ، لێرەش دا هەر بە یارمەتی ژمارەی (یەك) درووست دەبێت کە دەخرێتە دوای ژمارەی دووەمەوە کە ژمارەی ژێرەوەیە،

واته له دەستپێك دا ژمارەی سەرەوە، ئینجاهی ژێرەوە دەخوێنینەوەو لە پاشان ژمارەی(یەك) ی دەخەینە سەر، ئەم جۆرە خوێندنەوەیەش لەو ژمارە كەرتییانەدا دەردەكەوێت كە سەرەیان لە یەك زیاترە، (سیّ, پێنج, یەك) (شەش حەفت یەك) (بیست شەست یەك)......هتد.

لە ڕستەی (ب)ش دا، هەر بە هەمان شێوە ژمارەی كەرتی (دوو, هەشت, یەكا) لە سیّ ژمارەی بنجی (دوو، هەشت، یەك) دروست بووە، ئەوەندە هەیە لێرەدا ئامرازی دانەپالّ (ا)ە نەك (ی).

٣- لە هەردوو ڕستەی ژمارە (٣)ش دا دیسان ژمارەی كەرتی (سیّ, بیست, یەك) ئەندازەی ئەو كەرتە ڕادەگەیەنێت كە ژمارەی خوێندكارەكانی پیّ دەست نیشان دەكەین كە لە تاقیكردنەوەی ڕێزمانی كوردی دا دەرنەچوون، ئەو ژی ل سیّ هژماران پێكدێت (سیّ، بیست، یەك) و بەهۆی ئامرازی دانەپالّی (ی) لە رستەی یەكەم و (ئـ) لە ڕستەی دووەم دا كاری دەست نیشانكردن و وەسفكردنی خوێنكارانی دەرنەچوو پیشان داوە.

٤- لە ڕستەی (ئـ) و (ب)ی ژمارە چواریش دا، ئەو جۆرە كەرتانە بەم شێوەیە دهێنە خاندن : (لە) یان (ژ) ئینجا ڕێژەكە ، كەسەدە ، لە پاشان خودی ژمارە، واتە دەلّێین : لە سەدا (ن) یان ژ سەدا (ن).......هتد ژمارەكە دەخوێنینەوە . ئەم جۆرە ژمارە كەرتییەش پێی دەگوترێت كەرتی سادە.

٥- لە ڕستەكانی ژمارە (٥) و (٦) و (٧) یش دا, ژمارە كەرتیەكان, كەرتی یین و خوێندنەوەیان بەم جۆرە دەبێت:

ئـ- (لە) , (ژ) دەیا (ن) , دەها (ن) .......... ئینجا ژمارەكە

ب- (لە) , (ژ) سەدا (ن) .......... ئینجا ژمارەكە

پ- (له) , (ژ) هەزارا (ن) .......... ئینجا ژمارەکە

٦- ژمارە (یەك) و (دوو) ناکەونە بەر دەستووری خوێندنەوەی کەرتەکانی تر کە سەرەیان یەك بێت، لێرەدا دەڵێیت یەك سێو بۆ من، ئەگەر کەرتەك $\frac{١}{٢}$ بوو، دەگوترێت نیو سێو ئانکو (نیڤ سێڤ) بۆ من.

**دەستوور:**

**١- هاوەڵناوی ژمارەیی کەرتی بەشێك لە ژمارە تەواوەکە پیشان دەدات واتە ئەندازەی کەرتەکە ڕادەگەیەنێت، ئەو ئەندازەیەش بریتیە لە چەندییەتی هەردوو بەشی کەرتەکە، ئەو پیشاندانەش بەهۆی ئامرازەکانی دانەپاڵی (ی) و (أ) و (یٚ) جیٚ بەجیٚ دەکرێت . ناوە وەسفکراوەکەش هەمیشە لە دووای ژمارە کەرتییەکەوە دێت. ئەم جۆرە هاوەڵناوە ژمارەییە هەمیشە لێکدراون .**

**٢- ئەگەر سەرەی هاوەڵناوە کەرتییەکە یەك بوو، بەڵام ژێرەی ژمارە سیٚ و بەولاوە بوو ئەوا لە گوتن دا،ژێرە دەگوترێت و(یەك) یان (ئێك)ی بەدوا دا دێت وەك چوار یەك (چارییێك- چارئێك)، هەشت یەك (هەشت ئێك).**

**٣- ئەگەر سەرە دوو یان زیاتر بوو، ئەوا لە گوتن دا، سەرە دەگوترێت، ئینجا ژێرەو لەپاشان ژمارە (یەك- ئێك) ی دەخرێتە دوا وەك سیٚ هەشت یەك، دوو پێنج یەك جاری وا هەیە بە (سیٚ لەسەر هەشت) یان (دوو لەسەر پێنج) دەخوێندرێت.[1]**

[1] ئەم جۆرە خوێندنەوەیە تازە هاتووەتە ناو زمانی کوردییەوە.

## ڕاهێنان ( ١ )

١- جیاوازی هاوەڵناوی ژمارەیی ڕێکخستن لەگەڵ هاوەڵناوی ژمارەیی بنجیی دا چییە ؟

ئـ- لە پێکهاتن دا ب- لە بەکارهێنان دا

٢- ئەو ژمارە بنجییانەی کە کۆتاییان دێت بە بزوێنی (ە ، ا ، ۆ ، ێ) چۆن دەکرێن بە هاوەڵناوی ژمارەیی ڕێکخستن.

## ڕاهێنان ( ٢ )

چەوتی ئەم ڕستانەی خوارەوە پیشان بدەو ئینجا بەڕاستی بیاننوسەوە.

١- ساڵی دووەمین ڕاپەڕینی گەلی کوردستان پەرلەمان و حکومەتی هەرێم دامەزران.

٢- کرێکاری دوو لە لایەن بەڕێوەبەری کارگەکەمان پاداشت کرا.

٣- قوتابیا پێنج ل وانێن زانستی یا باش نینە.

٤- مەولەوی یەك شاعیر بوو کە کێشی خۆماڵی زیندوو کردەوە.

## ڕاهێنان ( ٣ )

وشە هێڵ بەژێر داهاتووەکانی ئەم ڕستانە شلۆڤە بکە:

١- خانیا چارێ مالا هەڤالێ منە.

٢- نیڤەکا قوتابیێن ڤێ پۆلێ ل دوو وانان کەڤتینە.

٣- ئازاد لە هەشتەمین پێپیلکە کەوتە خوارەوە.

٤- سێیەکی دانیشتوانی ئەم گوندە هەژارن.

## (هاوەڵناوی نادیار)

ئەم دێڕە هۆنراوانە بخوێنەوە:

١- هەر ماهێ نەوبۆ حالم پەشێون
چون هیلال شێوەی ئەبرۆی تۆش پێوەن. (مەولەوی)

٢- هەموو عومرم بە زایەع چوو لە ڕێگەی عیشق دا چونکە
گرفتارو ئەسیری داوی عیشقی تفلێ فامێکم (کوردی)

٣- نەقدێ مە دبوو ب سکە مەسکووك
نەدما وەهە بێ ڕەواج و مەشکووك (ئەحمەدی خانی)

٤- هەندێ کەس ڕاستی بە خوار تێئەگەن
ئەغیاری میللەت بەیار تێئەگەن
کتێبی عیلمی و ئازادی ئەفکار
بە ئینسان خۆرکەو خونخوار تێئەگەن (دلزار)

٥- کەکێ منۆ
چ دارەکا رەهدرێژم
دڤی واریدا
باوو باهۆزید پاییزێ
پەلك وەراندن (عەبدولڕەحمان مزوری)
تا قڕاندن

**خستنەڕوو:**

سەرنج لە دێرە هۆنراوەکانی سەرەوە بدە. دەبینیت:

١- لەدێڕی یەکەم دا، پـەیڤی(هـەر) وەکـو هاوەڵنـاو بـەکارهاتووە و لـەپێش پەیڤی (ماهیٚ, مـانگ، هـەیڤ)دانـراوە و بەشـێوەیەکی نادیـار وەسـفی نـاوی (ماه) دەکات و، واتە بۆمانی دەست نیشان ناکات کەلە کـام کـاتی مـانگ دا، حالّی دەشێوێت وتووشی پەشـێوی دەبێـت، لەبـەر هەنـدیٚ پەیڤەکـە دەبێتـە (هاوەڵناوی نادیار).

٢- لەدێڕەهۆنراوەی دووەمیش دا، هەربەو جۆرە، پەیڤی (هەموو)هاوەڵنـاوە ولەپێش نـاوی (عـومر= تەمـەن = ژی) هـاتووە، بـەئاواییێکی نادیـار ودەسـت نیشان نەکری، وەسفی ناوەکـەدەکات بـەجۆرێکی وا کـەنازانین مـاوەی ئـەو عـومرەی بـەفیڕۆ چـووە لـەڕێی عیـشق دا چـەندە، بۆیـە ئـەویش هـەرپێی دەگوتریٚ، (هاوەڵناوی نادیار).

٣- لـەدێرە هـۆنراوەی سـێیەمیش دا،پـەیڤی(وەهـە=وەهـا=وا) هاوەڵنـاوەو لەپێش ناوی (ڕەواج) هاتووەو بەشێوەیەکی نادیار وەسفی بیٚ ڕەواجییەکەی کـردووە، بـەجۆرێك کـەناتوانین دەسـت نیـشانی ڕادەی یـان بـڕی ئـەو بـیٚ ڕەواجییەبکەین، هەرژبەر هەندێیە دبێژنیٚ (هاوەڵناوی نادیار).

هەر بەوجۆرە پەیڤەکانی (هەندیٚ، چ، گەلێك)کەبـەڕیزە لـەدێرە هۆنراوەکـانی ژمـارە(٤) و (٥) و (٦) دا هـاتوون هەریەکـەیان لەگـەڵ ناوێـك داهـاتوون و وەسفی ناوەکە دەکەن بەلاٚم بەئاواو شێوەیەکی پەنهان ونادیار، بۆیە بە هەر یەك لەوانەش دەگوترێت (هاوەڵناوی نادیار).

**دەستوور:**

**١- هاوەڵناوی نادیار، هاوەڵناوێکە کەجۆر و چۆنیەتی ،یاژمارەو بڕی ناوەکە بەشێوەیەکی نادیار دەست نیشان دەکات ویا دەخرێتە پێش ناوەکە یان جێناوەکە ،ئەو کاتە پێویستی بەئامرازی پەیوەندی نابێت ،یان دەخرێتە دوای (پشتی) ناوەکە ،یان جێناوەکە وئەوکاتە پێویستی بەئامرازی پەیوەندی دەبێت.**

**٢- هەندێ لەوهاوەڵناوە نادیارانە ئەمانەن:**

**(چەند= هەندێ(هەندك)، هەر،هەموو (تەڤ) دیکە (دی) تر (دن) فلان ،فیسار، چەندین، ئەوەندە، (هند،هندە) وەها(وەهە ،وا (وەسا ،وەتوف، چ، هین، گەلێك، گەلەك، زۆر، کەم (کێم)، بڕێ ، پیچەك, هەمی.**

**٣- ئەو پەیڤانەی کەبە (هاوەڵناوی نادیار) ناومان بردن ،لەناویان دا پەیڤی (هەر) هەمیشە هەر بەهاوەڵناوی دەمێنێتەوە وپەیڤی(زۆر، گەلێك، هەندێك، کەمێك..)یش هەندێ جار هاوەڵناوەو هەندێجاریش دەبیتەهاوەڵکار ئەوانی دی، دەکرێ بەبێ ناو بەکاربهێن و ببنە (جێناوی نادیار) وەك:**

**ئەم ڕووبارە ئاوی کەمە . برنجەکە زۆربوو، پێمان نەخورا.**

## ڕاهێنان ( ١ )

ئەم دێڕە هۆنراوانە بخوێنەوەو هەر هاوەڵناوێکی نادیاریان تێدا بێت دەریان بهێنە:

عالەم هەموو وەك تەیرە ، تەمەع دانە، ئەمەل داو

سەییادی ئەجەل، ساحەتی دونیا قەفەسێکە (تاهیر بەگی جاف)

٢- ئەڤ ڕۆم و عەجەم بووان حەسارن
کرمانج هەمی لە چار کەنـــــارن (خانی)

٣- نە نەسرین بەسە باسی ئێستەمان
هیچ دادی نییە فرمێســـــــــک ڕژان
ڕۆییو ، ڕۆییوە ، ئێستاش ئاوایــــە
دوا ڕۆژیش لە دەست من و تۆ دایە ( ع . ق )

٤- ئەوەی مێژووی کورد بخوێنێتەوە
ئەڵقەی زێڕینی بهۆنێتـــــــــــەوە
تێئەگا هەرگیز سەر نانێـــــتەوە
هیچ هێزێ نییە بیتوێنێـــــتەوە (موکری)

## ڕاهێنان ( ٢ )

ئەم هاوەڵناوە نادیارانە لە ڕستەدا بەکار بهێنە
(پیچەك = هیچ = هەندێ = هەمی= هەر= دن)

## ڕاهێنان ( ٣ )

ئەم ڕستانەی خوارەوە شی بکەوە
١- چەند کتێبێکم کڕی
٢- دیمەنی وەهام نەدیتووە

# (جێناوی نادیار)

ئەم ڕستانە بخوێنەوە:

١- هەموو لە تاقیکردنەوەکە دەرچوون.

٢- گشت ئامادە بوون.

٣- ئەز فلان ناس دکەم.

٤- کابرا لە کارەکەیدا سەرنەکەوت.

٥- هیچم لە یاد نەکردووە.

٦- من تشتەك ژبیر نەکریە.

٧- کەس دڤێریٚ ڕا نەچوویە باژێڕی.

٨- ئازادی چ نەخاریە.

٩- وانەکم لیٚ کەوتووە.

## خستنەڕوو:

لەمەوپێش زانیومانە کە جێناو لە جیاتی ناوێك بەکاردێت لە ڕستەدا، ئینجا ئەگەر سەیری ڕستەکانی سەرەوە بکەین، دەبینین لە هەر ڕستەیەك دا جێناوێکی نادیار هەیە، کە لە جیاتی ناوی مرۆڤێك, گیانلەبەرێك یان شتێکی تر بەکارهێنراوەو بەشێوەیەکی ئاشکرایی ئەو ناوە دیاری نەکراوە کە بەم شێوەی خوارەوەیە .

١- لە ڕستەی یەکەم دا پەیڤی (هەموو) جێناوی نادیارە چونکە لە بڕی چەند ناوێك بەکارهاتووە و بە ئاشکرایی ئەو ناوانە دیاری نەکراون لە ڕووی پێکهێنانییەوە سادەیە، چونکە لە یەك وشەی واتادار پێکهاتووە .

٢- لە ڕستەی دووەم دا وشەی (گشت) جێناوی نادیارە چونکە لە بڕی کۆمەڵە ناوێك بەکارهاتووە ، کە بە ئاشکرایی ئەم ناوانە دیاری نەکراون.

٣- له ڕستەی سێیەم دا پەیڤی (فلاَن) جێناوی نادیارە چونکە لە بڕی ناوی مرۆڤێك بەکارهاتووە، کە بە ئاشکرایی ئەو ناوە دیاری نەکراوە.

٤- له ڕستەی چوارەم دا وشەی (کابرا) جێناوی نادیارە چونکە لە بڕی ناوی ئادەمیزادێك بەکارهاتووە ، کە بە ئاشکرایی ئەو ناوە دیاری نەکراوە ،

٥- له ڕستەی پێنجەم دا وشەی (هیچ )جێناوی نادیارە چونکە لە بڕی ناوی شتێك بەکارهاتووە، کە بە ئاشکرایی ئەو ناوە دیاری نەکراوە ،

٦- له ڕستەی شەشەم دا وشەی (تشتەك) جێناوی نادیارە چونکە لە بڕی ناوی شتێك بەکارهاتووە، کە بە ئاشکرایی ئەو ناوە دیاری نەکراوە.

٧- له ڕستەی حەوتەم دا وشەی (کەس) جێناوی نادیارە چونکە لە بڕی ناوی مرۆڤێك بەکارهاتووە، کە بە ئاشکرایی ئەو ناوە دیاری نەکراوە.

٨- له ڕستەی هەشتەم دا پەیڤی (چ) جێناوی نادیارە چونگە لە بڕی ناوی شتێك بەکارهاتووە ، کە بە ئاشکرایی ئەو ناوە دیاری نەکراوە.

٩- له ڕستەی نۆیەم دا پەیڤی (وانەك)جێناوی نادیارە چونکە لە بڕی ناوی شتێك بەکارهاتووە ، کە بە ئاشکرایی ئەو ناوە دیاری نەکراوە.

**دەستوور:**

**جێناوی نادیار ئەو وشەیە کە لە بڕی ناوی مرۆڤێك یان گیانلەبەرێك یان هەر شتێکی تر بەکاردەهێنرێت، کە ئەو ناوە بە ئاشکرایی دیار نییە کە کێیە یان چییە؟ وەکو(هەموو، گشت، فلان، فیسار، کابرا، هین، هیچ، چ، تو، وانەك، هەرامە، کەس، تشت، هەندێك، هەندەك، خڕ، زۆر، گەلێك، هەمییا، هەمێی، یەکێك، هەمی، تەڤ، گەلەك، هند، هندە، ئەودی).**

# (ئەركی جێناوی نادیار لە ڕستەدا)

ئەم ڕستانە بخوێنەوە:

١- فلاّن زۆرزانە.

٢- كەس لە ئاهەنگی نەورۆز دوانەكەوت.

٣- هوین هەمێی دزانن.

٤- ئەوان هەواڵەكەیان بە فلاّن گوتووە.

٥- هەسپیْ كابرای هاتە دزین.

٦- هین بۆ دەرەوەی ولاّت نێرراوە.

٧- كەم و كورتیەكە لە كابرا بوو.

## خستنە ڕوو:

پێشتر زانیمان كە جێناوی نادیار لە برِی ناوێك بەكاردێت لە ڕستەدا، لەبەر ئەمە هەموو ئەركەكانی ناو لە ڕستەدا دەبینێت وەكو :

١- لە ڕستەی یەكەمدا وشەی (فلاّن) جێناوی نادیارە ئەركی نیهادی بینیوە.

٢- لە ڕستەی دووەمدا پەیڤی (كەس) جێناوی نادیارە ، ئەركی بكەری بینیوە.

٣- لە ڕستەی سێیەمدا پەیڤی (هەمیێ) جێناوی نادیارە ئەركی بەركارە لە ڕستەدا.

٤- لە ڕستەی چوارەمدا ووشەی (فلاّن) جێناوی نادیارە ئەركی تەواوكەری بە یاریدەیە لە ڕستەدا.

٥- لە ڕستەی پێنجەمدا پەیڤی (كابرا) جێناوی نادیارە ئەركی تەواوكەری ناوە لە ڕستەدا ،ناوی (هەسپی)پیْ تەواوكراوە واتە دیارخەری ناوە.

٦- له ڕستەی شەشەمدا وشەی (هین) جێناوی نادیارە، ئەرکی جێگری بکەری بینیوە.

٧- له ڕستەی حەوتەمدا وشەی (کابرا) جێناوی نادیارە ئەرکی تەواوکەری بەیاریدەی کاری ناتەواوەلە ڕستەدا.

**دەستوور:**

**جێناوی نادیار کە لە بڕی ناوێك بەکاردێت ، ئەرکی ناو لە ڕستەدا دەبینێت. وەکو (بکەر، نیهاد، بەرکار، تەواوکەری بەیاریدە،تەواوکەری ناو (دیارخەری ناو)، تەواوکەری کاری ناتەواو، جێگری کارا).**

## ڕاهێنان ( ١ )

ئەم جێناوانەی خوارەوە لەڕستەدا بەکاربهێنە: گشت، هەندێك، کەس، چ، هەرامە، وانەك.

## ڕاهێنان ( ٢ )

جێناوی(فلان) لەڕستەدا بەکار بهێنە بەمەرجێك هەموو ئەرکەکانی ناو ببینێت.

## ڕاهێنان ( ٣ )

لەم ڕستانەی خوارەوەدا جێناوە نادیارەکان دەربهێنە و ئەرکەکانیان دیاربخە.

١- خڕ هاتبوون.

٢- مەچ نەکریە.

٣- تۆ هینت بۆکوێ نارد؟

٤- یەکێك لەهاوڕێکانم زۆر زیرەکە.

٥- ئەم هەمێی دزانین.

٦- ئەمە فلان بوو.

٧- بلا کەس نەهێتە گرتن.

## ڕاهێنان ( ٤ )

ئەم ڕستانەی خوارەوە شلۆڤە بکە:

١- یەکێ لەکتێبەکانم بەکابرا بەخشی.

٢- شڤانی چ نەنڤیسییە.

## ڕاهێنان ( ٥ )

ئـ- جیاوازی لەنێوان هاوەڵناوی نادیار و جێناوی نادیار چییە؟ بەنموونە ڕوونی بکەوە.

ب- ئەم پەیڤانە جارێك بەهاوەڵناوی نادیارو جارێکیش بەجێناوی نادیار بەکاربێنە: (هیچ، هەمی، گشت، چ، هین)

## (کاری دارِژاو)

١- قەلأتی زیوی ڕووخاوە هەرەس بە تۆپی نەسیم
سەپاهی لالەو گولْ چادری لە جیْ هەلْدا (حاجی قادری کۆیی)

٢- مەمیْ ڕەبەن ئەڤیندار بوو
بەکۆ ڕابوو ژەهر تێکـــــــر
ب کینا ڕەش ڤەکۆلا بـــوو
ب زیندانا جزیریْ کـــــــر (سەبری بۆتانی)

٣- کە دەرکەوت مانگی دوو حەفتە سەراپەردەی درەخشان کرد
بە عینوانی سەفا دەستی جەفای لەو ناوەدا دەرکرد
(بێخود)

٤-خەرامان دەرکەوت لە توێی پەردەوە
پەچەی لە ڕووخسار مانگ لابردەوە (مەولەوی)

٥- با هۆزو باگەڕو بـــــــاران
نەمان چوون و وەلات بەردان (سەبری بۆتانی)

٦- لە ورشەی شەونم لە توێی پەردەوە
نەرگس بە مەستی چاوی کردەوە (مەولەوی)

## خستنەڕوو:

کاتێ سەیری ئەم دێڕە هۆنراوانەی سەرەوە دەکەین، دەبینین وشەکانی (هەڵدا، ڕابوو، تێکر، ڤەکۆلا، دەرکەوت، دەرکرد، لابردەوە، بەردا، کردەوە) هەموو کارن بەڵام ئەگەر بپرسین چ جۆرە کارێکن لە ڕووی دروست کردنەوە؟ دەڵێین کاری داڕژاون، چونکە هەریەکیان لە کارێکی سادە لەگەڵ پێشگرێك یا لەگەڵ پاشگرێك یا لەگەڵ هەردووکیان پێك هاتووە. بەم شێوەی خوارەوە.

١- لەدێڕە هۆنراوەی یەکەمداکاری(هەڵدا) کارێکی داڕژاوە، لەپێشگری (هەڵ)و کاری سادەی (دا) پێکهاتووەو بووە بەکارێکی داڕژاو،لەچاوگی داڕژاوی (هەڵدان) وەرگیراوە.

٢- لەدێڕە هۆنراوەی دووەمدا کاری(ڕابوو، تێکر، ڤەکۆلا) دارژاون، کاری (ڕابوو) لەپێشگری(ڕا) وکاری سادەی (بوو) پێکهاتووەو بووە بەکارێکی داڕژاو، لەچاوگی داڕژاوی (ڕابوون) وەرگیراوە، کاری (تێکر= تێکرد) لەپێشگری (تێ)و کاری سادەی (کر- کرد) پێکهاتووەو بووە بەکارێکی داڕژاو، لەچاوگی داڕژاوی (تێکرن- تێکردن) وەرگیراوە.

کاری (ڤەکۆلا) لەپێشگری (ڤە) و کاری سادەی (کۆلا) پێکهاتووەو بووە بەکارێکی داڕژاو لەچاوگی داڕژاوی (ڤەکۆلان) وەرگیراوە.

٣- لە دێڕە هۆنراوەی سێیەمدا کاری (دەرکەوت- دەرکرد) داڕژاون، کاری (دەرکەوت) لەپێشگری (دەر) وکاری سادەی (کەوت) پێکهاتووەوبووە بەکارێکی داڕژاو، لەچاوگی داڕژاوی (دەرکەوتن) وەرگیراوە کاری (دەرکرد) لەپێشگری (دەر) وکاری سادەی (کرد) پێکهاتووە و بووە بەکاری داڕژاو، لەچاوگی داڕژاوی (دەرکردن) وەرگیراوە.

٤- لەدێرە هۆنراوەی چوارەمدا کاری (دەرکەوت، لابردەوە) داڕژاون کاری (دەرکەوت) لەخاڵی پێشوو باسکراوە، کاری (لابردەوە) لە پێشگری (لا) وکاری سادەی (برد) و پاشگری (ەوە) پێکهاتووەو بووە بەکارێکی داڕژاو، لەچاوگی داڕژاوی (لابردنەوە) وەرگیراوە.

٥- لەدێرە هۆنراوەی پێنجەمدا کاری(بەردا) داڕژاوە، لەپێشگری (بەر) وکاری سادەی (دا) پێکهاتووەو بووە بەکارێکی داڕژاو، لەچاوگی داڕژاوی (بەردان) وەرگیراوە.

٦- لەدێرە هۆنراوەی شەشەمدا کاری(کردەوە) داڕژاوە، لەکاری سادەی (کرد) و پاشگری (ەوە) پێکهاتووەو بووە بەکارێکی داڕژاو، لەچاوگی داڕژاوی (کردنەوە) وەرگیراوە.

**دەستوور:**

**کاری داڕژاو کارێکی ناسادەیە لەکارێکی سادەی واتا دارو پاشگرێك یان پێشگرێکی بێ واتا پێك دێت یاخود لەگەڵ هەردووکیان پێك دێت بەم شێوەیەی خوارەوە:**

**ئ- پێشگر + کاری سادە= کاری داڕێژراو**

**هەڵواسی، هەڵبڕی، ڕاکرد، ڤەکر، داخست، ڤەمراند، ڕاپەڕی، وەرگرت، پێکرد، ڕونیشت، هەڵدا، داچوو، ڕویکر.**

**تێبینی: (١)**

ئەم پێشگرانە بەتەنیا هیچ واتایەکیان نییە، بەپێش کارە سادەکەی دەلکێن، بەگشتی پێشگری (هەڵ) واتای بەرزیو بۆسەرەوەیە، بەلام پێشگری (دا) واتای بۆخوارەوەیە، پێشگری (ڕا) بزوتنەوەیەکی ڕاستەوخۆ پیشان دەدات،

پێـشگری (وەر، گەڕانـــەوەو شـــوێن گـــۆڕین دەردەخـــات، پێـشگری (ڕوو) بزوتنەوەیە بۆخوارەوە.

((هەڵدڕی، هەڵواسی،هەڵدا، هەڵستا، هەڵکرد، هەڵکەڤت))

((داماڵی، دانیشت، داتەپی، دادڕی، دادا،........هتد))

((ڕابوو، ڕاماڵی، ڕاخست، ڕاکێشا، ڕاگرت،......هتد))

((ڕووچوو– ڕوونیشت، ڕووهات....هتد))

((وەرگەڕا، وەرگرت، وەرپێچا، وەربادا،.......هتد))

٢–پێشگر + کاری سادە + پاشگر = کاری داڕژاو

هەڵدایەوە / داخستەوە / هەڵخستەوە

هەڵ + دا + یـــ + ەوە = هەڵدایەوە

دا+خست + ەوە (ڤە) = داخستەوە (داخستەڤە)

هەڵ + دا + ڤە = هەڵداڤە

وەر+ پێچا + ڤە = هەڵداڤە

٣– کاری سادە + پاشگری (ەوە) = کاری داڕژاو

خوارد + ەوە = خواردەوە

چوو + ەوە = چووەوە

خوار + ەڤە = خوارەڤە

چوو + ڤە = چووڤە

هات + ەڤە = هاتەڤە

یان :

کاری سادە+ پاشگری "اند" کاری داڕژاو

ڕژا+ اند= ڕژاند          سووتا+ اند= سووتاند

**تێبینی: (٢)**

پاشگری (ەوە) دەچێتە سەرکاری سادەو ئەم گۆڕانکارییانە نیشان دەدات دوای ئەوە کارێکی داڕژاویان لێ دروست دەکات.

ئـ- واتای نوێو جیاواز لەکارە سادەکە دروست دەکات وەك :

برد +ەوە= (بردەوە) لێرەدا بەواتای (سەرکەوتن) دێت.

کرد+ەوە= (کردەوە) لێرەدا بەواتای کردنەوەی دەرگاو پەنجەرەو شتێکی داخراو بەکاردێت.

چوو+ ەوە= (چووەوە) لێرەدا بەواتای ڕەنگ چوونەوە بەکاردێت

وەك :

١- يارييەکەيان بردەوە.

٢- پەنجەرەکەی کردەوە.

٣- ڕەنگی کراسەکەی بەهەتاو چووەوە.

ب- بەمانای دووبارە کردنەوەی کارێك دێت :

هات+ەوە= هاتەوە

برد+ەوە = بردەوە

کرد+ەوە= کردەوە

١- هاوڕێ جارێکی تر هاتەوە بۆلامان.

٢- ئەم جارەش کتێبەکەی بردەوە.

٣- نوێژەکەم کردەوە .

پ- هەندێك جار کە دەچێتە سەر کاری سادە، واتای کارەکە تەواو دەکات چونکە کاری وامان هەیە کەبەسادەیی واتايان نييە.

وەك:

حەسا + ی + ەوە = حەسایەوە

دۆزی + ی + ەوە = دۆزییەوە

کولا + ی + ەوە= کولایەوە

لەرا + ی + ەوە = لەرایەوە

میوانەکە لەلامان حەسایەوە

پارەکەمان دۆزییەوە

برینەکەی کولایەوە.

**تێبینی:**

پاشگری (اند) لەبنچینەدا ((اندن))ە، کەدەچیتە سەر قەدی یا، ڕەگی چاوگی سادەی تێنەپەڕ، چاوگی داڕژاوی تێپەڕ دروست دەکات وەك:

ڕژا + اندن= ڕژاندن

مر + اندن= مراندن

سەپا+ اندن= سەپاندن

پاش لابردنی (ن) ی چاوگ کارێکی داڕژاوی تێپەڕ دروست دەبێت، چونکە وەکو دەزانین هەموو کارێك لەچاوگ وەردەگیرێت .

**تێبینی:**

لەبەرامبەر پاشگری (ەوە) لەشێوەی کرمانجی ژووروودا پێشگری (ڤە) بەکاردێت (۱) وەك :

ڤە + کر= ڤەکر

ڤە + تەمراند = ڤەتەمراند

ڤە + بوو = ڤەبوو

ڤە + ما = ڤەما

ڤە + مراند = ڤەمراند

ڤە + دا = ڤەدا

١- دەرگەھ ڤەکر

٢- ئاگر ڤەمراند

٣- پەنجەرك ڤەبوو

## ڕاهێنان ( ١ )

لەم دێڕە هۆنراوانەی خوارەوەدا هەرچ کاری داڕژاو هەیە دەری بهێنەو لەڕووی پێکهاتنییەوە دەست نیشانی بکە.

١- سبەینێ کەجەنگ دامر کایەوە
ئاگری هەراو شەڕ کوژایەوە (بێکەس)

٢- گەلێکم ڕۆژگاری تاڵ و شیرین ڕابوارد، ئاخۆ
مەرگ مەودا دەدا دیسان ببینم سەردەمێکی تر (هێمن)

٣- چەند جار سوتام و هەڵگەڕامەوە
بووم بە خۆڵەمێش دامرکامەوە (شێخ سەلام)

٤- شەتری و تایێن سوورو زەر
بایێ نەسیم لێدا سەحەر

ل وێ جەبهەتێ هژیان دووبەر

لەورا سوکاری بێ هشین (مەلای جزیری)

٥- لیم گەڕێ با دەربڕم سۆزی دەروون

لیم گەڕێ با هەڵوەرێنم ئەشکی ڕوون (هێمن)

٦- گولێ جانێ تە ئەز برم

ژ دنیایێ ئەز دەرکرم (سەبری بۆتانی)

## ڕاهێنان ( ٢ )

واتای ئەم پێشگرو پاشگرانەی خوارەوە دیاری بخەو لەگەڵ هەریەکێکیان دوو کاری داڕژاو دروست بکەو لە ڕستەدا بەکاری بێنە

(هەڵ ، وە، ڤە ، دا، ەوە)

## ڕاهێنان ( ٣ )

ئەم ڕستانە شی بکەوە:

١- ئاڵای کوردستان لە هەموو شوێنێك دەشەکێتەوە.

٢- لاپەڕەکانی گۆڤارەکەی لەسەرخۆ هەڵدەدایەوە.

٣- وی پەنجەرەك ڤەکر.

٤- مەمۆی ئاگرێ نەورۆزێ هەڵکر.

# (كاری لیکدراو)

ئـ:

١- میری ئەڤـ پێشمەرگە خەلات کر.

٢- رێگایان لەکاروانەکە گرت.

٣- نەخۆشەکە ناڵە نالی کرد.

٤- ئەوی خورتی دەست ڤەکر.

٥- رووداوەکەیان لەیاد کرد.

٦- سەرداری چیرۆك ژبیر کر.

هۆنراوەکانم بەبیرهاتنەوە.

ب:

١- ئەڤان خەباتکەران ئالأییێ کوردستانێ بلند کر.

٢- حوکومەتی کوردستان لەشکری کوردستانی بەهێز کرد.

٣- شڤانی هەڤالێن خۆ دلخۆش کرن.

٤- پەیمانەکەیان نۆیێ کردەوە.

٥- مرۆڤە کە بەئاگا هاتەوە.

٦- نووسەرەکە دڵشاد بووەوە.

پ:

١- بەرهەمی کارگەی چنینیان زۆرکرد.

٢- پیاوەکە کرێی خانووەکەی کەم کردەوە.

٣- نەخویندەڤانی ژناڤـ چوو.

ت:

١- پاپۆڕ دئاڤێدا نقووم بـــوو.

٢- مرۆڤە هەژارەکە پەکی کەوت.

٣- ئاسۆ کەل وپەلە شکاوەکانی فڕێدا.

## خستنە ڕوو:

لەمەو پێش زانیومانـە کەچاوگ سەرچاوەی کـارە، واتـە کـار لەچـاوگ دروسـت دەکرێـت، بـەلابردنی پیتـی(ن)ی چـاوگ، کـاری لێکـدراو لەچـاوگی لێکدراو دروسـت دەکرێـت. چـاوگی لێکـدراویش وەکـوو پێـشتر خوێندوومانـە لەچاوگی سادە یا داڕژاو لەگەڵ وشەیەکی واتاداری تر یا زیاتر پێکدێت.

ئـ- ئەگەر سەیری ڕستەکانی بەشی (ئـ) بکەین ، دەبینین لـە هـەر ڕسـتەیەك دا کارێکی لێکدراو هەیە کە لە چاوگێکی لێکدراو وەرگیراوەو چاوگەکەش بەم شێوەی خوارەوە پێکهاتووە.

١- لە ڕستەی یەکەم دا کاری (خەڵاتکر= خـەڵاتکرد) کـارێکی لێکـدراوەو لـە دوو پـەیڤی واتـادار پێکهـاتووە، کەلـە چـاوگی (خـەڵات کـرن وەرگـیراوە) چاوگەکە لە ناوێکی سادەو چاوگێکی سادە پێکهاتووە (خەڵات + کرن)

٢- لە ڕستەی دووەم کاری (ڕێگـا گـرت) کـارێکی لێکـدراوەو لـە دوو وشـەی واتـادار پێکهـاتووە کـە لـە چـاوگی (ڕێگـا گـرتن) وەرگـیراوە ، چـاوگەکە لـە ناوێکی داڕژاوو چاوگێکی سادە پێکهاتووە (ڕێگا + گرتن) .

٣- لە ڕستەی سێیەم دا کاری (ناڵـە نـالی کـرد) کـارێکی لێکـدراوە ، لـە دوو وشەی واتادار پێکهاتووە کە لە چاوگی (ناڵە ناڵ کردن) وەرگیراوە چـاوگەکە لە ناوێکی لێکدراوو چاوگێکی سادە پێکهاتووە (ناڵە ناڵ + کردن)

٤- له ڕستەی چوارەم دا کاری (دەست ڤەکر = دەست ڤەکرد) کارێکی لێکدراوەو له دوو وشەی واتادار پێکهاتووە کە لە چاوگی (دەست ڤەکرن, دەست ڤەکردن) وەرگیراوە چاوگەکە لە ناوێکی سادەو چاوگێکی دارِژاو پێکهاتووە (دەست + ڤەکرن)

٥- له ڕستەی پێنجەم دا کاری (له یاد کرد) کارێکی لێکدراوە له دوو وشەی واتادار پێکهاتووە ، کە لە چاوگی (لەیاد کردن) وەرگیراوە، چاوگەکە لە ناوێکی دارِژاوو (گرێی ناوی) چاوگێکی سادە پێکهاتووە (لەیاد + کردن)

٦- له ڕستەی شەشەم دا کاری (ژبیر کر) کارێکی لێکدراوە لە دوو وشەی واتادار پێکهاتووە، کە لە چاوگی (ژبیر کرن) دروستکراوە چاوگەکە لە گرێیەکی ناوی و چاوگێکی سادە پێکهاتووە (ژبیر + کرن)

٧- له ڕستەی حەوتەم دا کاری (بەبیر هاتەوە) کارێکی لێکدراوە لە دوو پەیڤی واتادار پێکهاتووە ، کە لە چاوگی (بەبیرهاتنەوە) دروستکراوە، چاوگەکە لەگرێی ناوی و چاوگێکی دارِژاو پێکهاتووە .(بەبیر+ هاتنەوە)

ب-

کاتێ سەیری ڕستەکانی بەشی (ب) دەکەین، دەبینین لەهەر ڕستەیەك دا کارێکی لیکدراو هەیە، کەلەچاوگێکی لێکدراو دروست کراوە، چاوگەکەش بەم شێوەی خوارەوە پێکهاتووە :

١- لەڕستەی یەکەم دا کاری (بلند کر=بلند کرد) کارێکی لێکدراوە، لەدووپەیڤی واتا دار پێکهاتووە ، کەلەچاوگی (بلند کرن) وەرگیراوە، چاوگەکە لەهاوەڵناوێکی سادە وچاوگێکی سادە پێکهاتووە . (بلند+کرن).

٢- لەڕستەی دووەم دا کاری(بەهێز کر) کارێکی لێکدراوە، لەدوو وشەی واتادار پێکهاتووە، کە لە چاوگی (بەهێز کردن) وەرگیراوە چاوگەکە لەهاوەڵناوێکی داڕژاوو وچاوگێکی سادە پێکهاتووە.(بەهێز +کردن)

٣- لەڕستەی سێیەم دا کاری (دڵخۆش کر=دڵخۆش کرد)، کارێکی لێکدراوە، لەدوو وشەی واتادار پێکهاتووە، کەلەچاوگی (دلخۆش کرن) وەرگیراوە، چاوگەکە لەهاوەڵناوێکی لێکدراو وچاوگێکی سادە پێکهاتووە . (دلخۆش+ کرن)

٤- لەڕستەی چوارەم دا کاری (نوێ کردەوە) کارێکی لێکدراوە، لەدوو وشەی واتادار پێکهاتووە، کەلەچاوگی (نوێ کردنەوە) دروست کراوە چاوگەکە لەهاوەڵناوێکی سادەو چاوگێکی داڕژاو پێکهاتووە.(نوێ + کردنەوە).

٥- لەڕستەی پێنجەم دا کاری (بەئاگاهاتەوە) کارێکی لێکدراوە ، لەدوو وشەی واتادار پێکهاتووە، کەلەچاوگی (بەئاگاهاتنەوە) دروست کراوە چاوگەکە لەهاوەڵناوێکی داڕژاوو وچاوگێکی داڕژاو پێکهاتووە.

٦- لەرستەی شەشەم دا کاری (دڵشاد بووەوە) کارێکی لێکدراوە، لەدوو پەیڤی واتادار پێکهاتووە، کە لە چاوگی (دلشاد بوونەوە) وەرگیراوە، چاوگەکە لەهاوەڵناوێکی لێکدراو وچاوگێکی داڕژاو پێکهاتووە (دلشاد +بوونەوە).

پ :

دیسان ئەگەر سەیری ڕستەکانی بەشی (پ) بکەین، دەبینین کاری لێکدراو هەیە کە بەم شێوەی خوارەوە پێکهاتووە:

١- لەڕستەی یەکەم دا کاری ( زۆرکرد) کارێکی لێکدراوە، لەدوو پەیڤی واتا دار پێکهاتووە، کەلەچاوگی (زۆر کردن) وەرگیراوە، چاوگەکە لەهاوەڵکارێکی سادەو چاوگێکی سادە پێکهاتووە (زۆر+ کردن)

٢- لەڕستەیدووەم دا کاری (کەم کردەوە) کارێکی لێکدراوە، لەدوو وشەی واتادار پێکهاتووە، کەلەچاوگی (کەم کردنەوە) دروست کراوە، چاوگەکە لەهاوەڵکارێکی سادەو چاوگێکی داڕژاو پێکهاتووە.(کەم+کردنەوە)

٣- لە ڕستەی سێیەم دا کاری (ژناڤ چوو) کارێکی لێکدراوە ، لە دوو وشەی واتادار پێکهاتووە، کە لە چاوگی (لەناوچوون) وەرگیراوە چاوگەکە لە هاوەڵکارێکی داڕژاوو چاوگێکی سادە پێکهاتووە (ژناڤ + چوون)

ت: دیسان ئەگەر سەیری ڕستەکانی بەشی (د) بکەین ، دەبینین لە ڕستەکان کاری لێکدراو هەیە ، کە بەم شێوەیەی خوارەوە پێکهاتووە.

١- لە ڕستەی یەکەم دا کاری (نقوم بوو) کارێکی لێکدراوە، لە دوو پەیڤ پێکهاتووە کە لە چاوگی (نقوم بوون) وەرگیراوە، چاوگەکە لە وشەی (نقوم) کە ئەمڕۆ مانای سەربەخۆی نییە لەگەڵ چاوگی بوون پێکهاتووە (نقوم + بوون)

٢- لە ڕستەی دووەم دا کاری (پەککەوت) کارێکی لێکدراوە لە دوو وشە پێکهاتووە، لە چاوگی (پەککەوتن) دروستکراوە ، چاوگەکە لە وشە ی(پەك) کە ئەمڕۆ مانای سەربەخۆی دیارنییە لەگەڵ چاوگێکی سادە پێکهاتووە (پەك + کەوتن)

٣- لە ڕستەی سێیەم دا کاری (فرێدا) کارێکی لێکدراوە، لە دوو وشە پێکهاتووە کە لە چاوگی (فرێدان) دروستکراوە چاوگەکە لە وشەی (فرێ) کە ئەمڕۆ مانای سەربەخۆی دیارنییە لەگەڵ چاوگێکی سادە پێکهاتووە، (فرێ + دان)

**دەستوور:**

**کاری لێکدراو:** ئەو کارەیە کە لە چاوگێکی لێکدراو دروست کراوە لە ناو ڕستەدا وەکو وشەیەکی سەربەخۆ ئەرکی خۆی دەبینێت, چاوگی لێکدراو لە دوو وشەی واتادار یا پتر پێکدێت بەم شێوەی خوارەوە

ئ- (ناو + چاوگ)

١. (ناوی سادە + چاوگی سادە) وەکو (دەست کەوتن ، ڕیزبوون ، یارمەتیدان ، ئاڤدان ، سواربوون ، سوارکردن)

٢. (ناوی داڕژاو + چاوگی سادە) وەکو (ڕێگا گرتن, گەرمابوون, جێگەبوون)

٣. (ناوی لێکدراو + چاوگی سادە) وەکو (ناڵە ناڵ کردن, ماڵئاوایی کردن)

٤. (ناوی سادە + چاوگی داڕژاو) وەکو: (دەست هەڵبڕین، چاولێبوون، چاوپێکەوتن، دەست ڤەکرن، دەست پێکردن)

٥. (گرێی ناوی + چاوگی سادە) وەکو: (لەهۆش چوون، ژبیرچوون، لەبیرکردن، بەدەست هێنان).

٦. (گرێی ناوی + چاوگی داڕژاو) وەکو: (بەبیرهاتنەوە، لەیادچوونەوە، بەبیرهێنانەوە).

ب: (هاوەڵناو + چاوگ).

١. (هاوەڵناوی سادە + چاوگیسادە) وەکو:(بلند کردن، خۆش کردن، گەش کردن، گەرم کردن، پڕکردن، گەورەبوون).

٢. (هاوەڵناوی داڕژاو + چاوگی سادە)وەکو: (بەهێزکردن، نەخۆش کەوتن)

٣. (هاوەڵناوی لێکدراو + چاوگی سادە) وەکو (دڵخۆش کردن ، ڕوو ڕەش کردن ، دڵ سارد کردن، دڵشاد بوون)

٤. (هاوەڵناوی سادە + چاوگی داڕژاو) وەکو (نویٚ کردنەوە ، تیژکردنەو، شین بوونەوە)

٥. (هاوەڵناوی داڕژاو + چاوگی داڕژاو) وەکو (بەئاگاهاتنەوە ، بەهێز بوونەوە)

٦. (هاوەڵناوی لێکدراو + چاوگی داڕژاو) وەکو (دڵ ساردکردنەوە دڵخۆش کردنەوە)

پ: (هاوەڵکار + چاوگ)

١.(هاوەڵکاری سادە + چاوگی سادە) وەکو (زۆرکردن ، کەم کردن ، کەم بوون)

٢. (هاوەڵکاری سادە + چاوگی داڕژاو) وەکو (کەم کردنەوە، زۆر کردنەوە)

٣. (هاوەڵکاری داڕژاو + چاوگی سادە) وەکو (ژ ناڤ چوون ، لەناوبردن ، لەناونان)

ت: (پەیڤەك مانای سەربەخۆی نییە + چاوگی سادە) وەکو (نقوم بوون، وازهێنان ، پەککەوتن ، فڕێدان ، هاندان ، فێربوون ، فێرکردن)

## ڕاهێنان ( ١ )

کاری لێکدراو بە چەند ڕێگا دروست دەکرێت؟ بۆ هەر ڕێگەیەك دوو نموونە بهێنەوەو لە ڕستەدا بەکاریان بهێنە .

## ڕاهێنان ( ٢ )

لەم کارانەی خوارەوە دا کاری لێکدراو درووست بکەو لە ڕستەدا بەکاریان بهێنە . چۆنیەتی دروست کردنەکە ڕوون بکەرەوە :

(کەوت، هەڵگرت، دا، بوو، کردەوە، هەڵبڕی، گرت)

## ڕاهێنان ( ٣ )

لەم دێرە هۆنراوانەی خوارەوەدا هەرچ کاری لێکدراو هەیە دەری بهێنەو چۆنیەتی دروست کردنەکەشی دیاربخە .

١- ئەو کەسەی گیانی لە ڕێگەی نیشتیمانا بەخت ئەکا
پێی مەڵێن مردووە ، شەهیدە وا لە فیردەوسی بەرین (بێکەس)

٢- بەندو زنجیر دێ ڤەبن جەرحێن دکول دێ خوەش بکت
لەوکو ناڤێ دلبەرێ دەرمانێ دەردێ بەندەیە (جزیری)

٣- غونچە لە با ژ ڕەنگ گولێ دێمێ ب سەر نوما مەلێ
شوبهەتی بولبولان سەمەر لەو مەفغان و نالە کر (جزیری)

٤- داری ئازادی بە خوێن ئاو نەدرێ قەت بەرناگرێ
سەربەخۆیی بێ فیداکاری ئەبەد سەرناگرێ (بێکەس)

چیمەنێ دێمێ تە گەش بوو نوی بەهارە ڕست و خۆش بوو
کەسك و سۆرە پڕ لە نوورە سوبح و شام لێ کەت خوناڤـــ
بەژن و بالاّ یاسەمین بوو، باغێ زولّفا تازە شـــــــین بوو
ژوان دباریت شیرو شەکرو عەنبەرو مسك و گـــــــولاڤـــ

## ڕاهێنان ( ٤ )

ئەم ڕستانەی خوارەوە شلۆڤە بکە .

١- ڤی خەباتکەری دێ خەلاتکەن.

٢- ئەزێ خانی ئاڤا دکەم

## (کاری تێنەپەڕ و کاری تێپەڕ)

(ئـ)

١- نەخۆشەکە نووست — نەخۆشەکە دەنوێت

٢- دوێنێ چووم بۆ بازاڕ — سبەینێ دەچم بۆ بازاڕ

٣- ڤیان گەڕایەوە — ڤیان دەگەڕێتەوە

(ب)

١- ئالان پەنجەرەکەی داخست — ئالان پەنجەرەکە دادەخات

٢- ئەڤین نانەکەی خوارد — ئەڤین نانەکە دەخوات

٣- نووسەرەکە چیرۆکێکی نووسی — نووسەرەکە چیرۆکێك دەنووسێت

کار بریتییە لە وشەیەك کە کارێك یان حاڵ و بارودۆخی کەسێك یان شتێك باس دەکات لەکاتێکی زانراودا، هەروەها کاری تێنەپەڕ ئەو کارەیە کە ئەرکی کارەکە لە بکەرەکەیەوە تێناپەڕێتە سەر کەسێك یان شتێکی تر و بەتەنیا واتای تەواو دەدات بەدەستەوە.

١- ئەگەر سەرنجی ڕستەکانی بەشی (ئـ) بدەین ئەو ڕاستیەمان بۆ دەردەکەوێت، بۆنموونە لە ڕستەی یەکەمدا کرداری (نووست - دەنوێت) بەبێ یاریدەی وشەیەکی تر یەکسەر واتای ڕستەکەی دەرخستووە و بووە بە کار بۆ بکەرەکەی و ئەرکی کارەکەش لە بکەرەکەوە تێنەپەڕیوە بۆ سەر کەسێك یان شتێکیتر، هەروەها کارەکانی ڕستەی دووەم و سێیەم (چووم - دەچم، گەڕایەوە - دەگەڕێتەوە) هەر بەهەمان شێوە لە شوێنی خۆیاندا کارێکی تێنەپەڕن.

٢- بەڵام لە ڕستەکانی بەشی (ب) دا کارەکانی (داخست - دادەخات ، خوارد - دەخوات، نووسی - دەنووسێت) بەتەنیا واتای تەواوی ڕستەکان نادەن بەدەستەوە بۆنموونە ناتوانین بڵێین: (ئالان داخست) یان (ئالان دادەخات) چونکە ئەم کارە بەیاریدەی وشەیەکی ترەوە توانیویەتی واتای ڕستەکە تەواو بکات کە بەم وشەیە دەگوترێت (بەرکار). لەمەوە بۆمان دەردەکەوێت لە ڕستەی یەکەمدا (ئالان) بکەری ڕستەکەیە و کارێکی کردووە و ئەرکی کارەکە کەوتۆتە سەر شتێکی تر ئەویش (پەنجەرەکەیە) بەهۆی ئەمەوە کارەکە واتای ڕستەکە تەواو دەکات و دەبێت بە کارێکی تێپەڕ بۆ بکەری ڕستەکە، هەروەها لە ڕستەکانی بەشی (ب) بۆمان دەردەوکەوێت کە ئەرکی کارەکان بەهەمان شێوەیە و لە هەریەکێك لە ڕستەکاندا ئەرکەکە تێپەڕیوە بۆ سەر وشەیەکی تر (نان ، چیرۆك) و ئەمانیش دەبن بە (بەرکار) و واتای کارەکانیان تەواو دەکەن.

**دەستوور:**

**کاری تێنەپەڕ کارێکە ئیشێك یان حاڵ و بارودۆخی کەسێك یان شتێك پیشان دەدات لەکاتێکی دیاریکراودا و بەتەنیا واتای تەواو دەدات بەدەستەوە و ئەرکەکەی پەیوەندی بە بکەرەوە هەیە.**

**کاری تێپەڕ کارێکە ئیشێك یان حاڵ و بارودۆخی کەسێك یان شتێك پیشان دەدات لەکاتێکی دیاریکراودا و پێی دەگوترێت بەرکار و هەمیشە ئەرکی کردارەکە لە بکەرەوە تێدەپەڕێتە سەر کەسێك یان شتێکی تر.**

## ڕاهێنان ( ١ )

لەمانەی خوارەوەدا کاری تێنەپەڕ و کاری تێپەڕ جیار بکەوە و تێپەڕەکان لە ڕستەدا بەکاربهێنە:

سەربڕی، کەوتبوو، دەنووسێت، دەفڕێت، هەڵگرتووە، ڕاخست، ڕۆیشت، دەمرد، نووست.

## ڕاهێنان ( ٢ )

ئەمانەی خوارەوە لە ڕستەدا بەکاربهێنە بەمەرجێك جارەك ببن بە بکەر و جارێك ببن بە بەرکار:

کۆتر، گوڵ ، دیوار، پیاو

## ڕاهێنان ( ٣ )

لەم پارچە هۆنراوانەدا کاری تێپەڕ و تێنەپەڕ دەربهێنە.

١- ئەڵێن جەردەی ئەجەل ڕێگا بە کاروانی نەفس ئەگرێ

شەقامی سینە ئەبڕێ بۆ مەتاعی دیدە ئەڕوانێ

تەریدەی نەفس و شەیتان، قافڵەی قاعاتی غارەت کرد

ئەگەر جاسووس ئیمان نەبێ دەرناچێ ئینسانێ

(حەریق)

٢- گلۆپەکانی سەر جادە و کـــــۆڵان

زەرد هەڵگەڕابوون کز کز ئەسووتان

ئاسمانی شین و ئەستێرەکانـــــی

پێدەکەنین بۆ بەری بەیانــــــی

(گۆران)

## ڕاهێنان ( ٤ )

جیاوازی نێوان کاری تێنەپەڕ و کاری تێپەڕ چییە؟ ڕوونی بکەرەوە و باسەکەت بە نموونەوە بسەلمێنە.

## ڕاهێنان ( ٥ )

**شیکردنەوە.**

١- باران باری.

باران: ناوە، سادەیە، بکەرە، بەرجەستەیە.

باری: کاری ڕابردووی نزیکە، تێنەپەڕە.

٢- ئەم ڕستانە شیبکەوە.

ئـ- ئاشەوان گەنم دەهاڕێت.

ب- کەروێشکەکە لە دەوەنەکەوە دەرپەڕی.

پ- ئاسنگەر پاچ و بێل دروست دەکات

ت- منداڵەکە لە بێشکەکەدا نووستووە.

## (گۆڕینی کاری تێنەپەڕ بۆ کاری تێپەڕ)

١-

ئ- نامەکە گەیشت — نامەکەیان گەیاند

منداڵەکەنووست — ئەو منداڵەکەی نوواند

لەشکریدوژمن بەزی — لەشکری دوژمنیان بەزاند

ب-

شوشەکە شکا — ڕێبوار شووشەکەی شکاند

دیوارەکە ڕووخا — ئەو دیوارەکەی رووخاند

مرۆڤەکە ترسا — مرۆڤەکەیان ترساند

پارەکە لەدەست چوو — ئەوان پارەکەیان لەدەست چوواند

٢- نەخۆشەکە نالاندی — نەخۆشەکەی هێنایە نالاندن

بەرخەکە باڕاندی — بەرخەکەیان هێنایە باڕاندن

گایەکە بۆڕاندی — گایەکەی هێنایە بۆڕاندن

**خستنە ڕوو:**

کاتێک سەیری ڕستەکانی لای دەستە ڕاستی بەشی ژمارە (٢ ، ١) دەکەین، دەبینین کاری (گەیشت، نووست، بەزی، شکا، رووخا، ترسا، لەدەست چوو، نالاند، باڕاند, بۆڕاند) لەڕستەدا بەکار هێنراون، هەریەکێك لەم کارانە لەشوێنی خۆی دا کارێکی تێنەپەڕە ،چونکە کاری کەسێك یاشتێکی دەرخستووە لەکاتێکی دیاری کراودا ، هەروەها کاریگەری کارەکە لە بکەر تێنەپەڕیوە،واتە تەنها بکەری وەرگرتووە ومانای تەواوی بەخشیوە.

بەلأم کاتێك سەیری ڕستەکانی لای دەستە چەپی بەشی ژمارە (١- ٢) دەکەین، دەبینین کاری (گەیاند، نوواند، بەزاند، شکاند، ڕووخاند، ترساند، لەدەست چوواند، هێنایە نالأندن، هێنایە باڕاندن، هێنایە بۆڕاندن) لەڕستەکەدا بەکارهێنراون، هەریەکێك لەم کارانە لەشوێنی خۆی دا کارێکی تێپەڕە، چونکە کاری گەرییەکەی لە بکەر تێپەڕیوە و کەوتۆتە سەربەرکار، واتە بێجگە لە بکەر پێویستی بە بەرکار هەیە تا واتای تەواو ببەخشێت.

ئینجا لەکاتی گۆڕینی کاری تێنەپەڕ بۆکاری تێپەر پێویستیمان بەڕەگی کار یا قەدی چاوگ (بناغەی چاوگ) هەیە، کەپاشگری (اندن) دەخەینە سەر ڕەگی کار یاقەدی چاوگ، چاوگێکی تێپەر دێتە کایەوە، دەتوانرێت لەچاوگە تازەکە کاری ڕابردوو، ڕانەبردوو، داخوازی دروست بکرێن بەپێی ئەو دەستوورانەی کەپێشتر خوێندوومانن، چاوگی تێنەپەڕ بەم شێوەیە دەگۆڕین بۆچاوگی تێپەڕ:

١- ئـ

| چاوگی تێنەپەڕ | ڕەگی کار | پاشگر | چاوگی تێپەڕ |
|---|---|---|---|
| گەیشتن | گە + یـ | اندن | گەیاندن |
| نووستن | نـــوو | اندن | نوواندن |
| بەزین | بـــەز | اندن | بەزاندن |
| مردن | مـــر | اندن | مراندن |
| ڕۆیشتن | ڕۆ | اندن | ڕوواندن |
| تەپین | تەپ | اندن | تەپاندن |

ب:-

| چاوگی تێپەڕ | پاشگر | قەدی چاوگ | چاوگی تێنەپەڕ |
| --- | --- | --- | --- |
| شکاندن | اندن | شکا | شکان |
| ڕووخاندن | اندن | ڕووخا | ڕووخان |
| ترساندن | اندن | ترسا | ترسان |
| گریاندن | اندن | گریا | گریان |
| لەدەست چوواندن | اندن | لەدەست چوو | لەدەست چوون |

٢- هەندێك چاووگی تێنەپەڕ هەن کەلەدەنگە سروشتییەکان دروست کراون بەیارمەتی پاشگری (اندن) وەکو (نالاَندن، باڕاندن، بۆڕاندن، قیژاندن، نووزاندن.......) ئەم چاوگانە هەر چەندە لەدەنگە سروشتی وپاشگری (اندن) دروست کراون بەلاَم هەر تێنەپەڕن، واتە بەپێی ئەو دەستوورەی پێشتر بەهۆی (اندن) ناکرێن بە چاوگی تێپەڕ بەڵکو دەتوانرێت بەیارمەتیی کاری یاریدەدەری(هێنایە) یان(دەهێنێتە) کە دەخرێتە پێش چاوگی تێنەپەڕ بکرێن بەچاوگی تێپەڕ بەم شێوەیە :

| چاوگی تێپەڕ | کاری یاریدەر | چاوگی تێنە پەڕ | پاشگر | دەنگە سروشتی |
| --- | --- | --- | --- | --- |
| هێنایە نالاَندن | هێنایە | نالاَندن | اندن | ناڵە |
| هێنایە باڕاندن | هێنایە | باڕاندن | اندن | باڕە |
| هێنایە بۆڕاندن | هێنایە | بۆڕاندن | اندن | بۆڕە |
| هێنایە قیژاندن | هێنایە | قیژاندن | اندن | قیژە |
| دەهێنێتە قیژاندن | دەهێنێتە | | | |

**ڕوون کردنەوە:**

ئەگەر ڕەگی کار یا قەدی چاوگ یا دەنگی سروشتی بە پیتی بزوێن کۆتایی هاتبوو، پیتێکی نەبزوێنی بۆ زیاد دەکەین یان پیتە بزوێنەکە لادەبەین. چونکە دوو پیتی بزوێن بەدوای یەکتردا نایەن.

**دەستوور:**

**گۆڕینی کاری تێنەپەڕ بۆ کاری تێپەڕ**

-١

ئـ- (**ڕەگی کار** + **اندن**) =**چاوگی تێپەڕ**

ب- (**قەدی چاوگ** + **اندن**) = **چاوگی تێپەڕ**

پ- (**دەنگە سروشتی** + **اندن**) = **چاوگی تێنەپەڕ**

(**کاری یاریدەدەر هێنایە** + **چاوگی تێنەپەڕ**) = **چاوگی تێنەپەڕ**.

## ڕاهێنان ( ١ )

چۆن کاری تێنەپەڕو کاری تێپەڕ لێك جیادەکەیتەوە؟ بە نموونە ڕوونی بکەرەوە.

## ڕاهێنان ( ٢ )

بەچەند ڕێگا کاری تێنەپەڕ دەگۆڕێت بۆ کاری تێپەڕ؟ بە نموونە ڕوونی بکەرەوە.

## ڕاهێنان ( ٣ )

چۆن لە دەنگە سروشتییەکان کاری تێپەڕ دروست دەکرێت ؟ بە چەند هەنگاو؟ بە نموونە ڕوونی بکەرەوە.

## ڕاهێنان ( ٤ )

ئەم کارە تێنەپەڕانەی خوارەوە بگۆڕە بۆ کاری تێپەڕ و لە ڕستەدا بەکاریان بهێنە.

(تێپەڕی، خشی، کەوت، برژا، خنکا، سووتا، وەری، چوو، ڕەڤی، هەڕمی)

## ڕاهێنان ( ٥ )

ئەم ڕستانەی خوارەوە شلۆڤە بکە.

١- پێشمەرگەی کوردستان لەشکری دوژمنی بەزاند.

٢- کارەساتەکە مرۆڤەکەی هێنایە قیژاندن.

## (هاوەڵکاری چۆنیەتی)

١- دەرگاکەم باش داخستووە.

٢- وانەکەمان بەپەلە نووسییەوە.

٣- گەلی کورد شێرانە لە بەهاری ساڵی ١٩٩١ دا ڕاپەڕی.

٤- ڕاوکەرەکان بە سواری چوون بۆ ڕاو.

٥- ئێمە بەسەربەرزی دەژین.

### خستنەڕوو:

ئەگەر بپرسین دەرگاکەت چۆن داخستووە؟ یان وانەکەتان چۆن نووسییەوە؟ یان گەلی کورد چۆن ڕاپەڕی؟ یان ڕاوکەرەکان چۆن چوون بۆ ڕاو؟ یان ئێوە چۆن دەژین؟ دەبینین لە وەڵامی پرسیاری ڕستەی یەکەمدا (باش) لە دووەمدا (بەپەلە) لە سێیەمدا (شێرانە) لە چوارەمدا (بە سواریی) لە پێنجەمدا (بەسەربەرزی)یە.

هەریەکەیان لە شوێنی خۆیاندا وەکو هاوەڵکارێك وەسفی چۆنیەتی ڕوودانی ڕستەکانیان دەکەن و دەبنە تەواوکەری واتای کارەکانیان. لەبەرئەوە بە هەر یەکێکیان دەوترێت (هاوەڵکاری چۆنیەتی).

هاوەڵکاری چۆنیەتی لەڕووی پێکهاتنەوە سێ جۆرە:

١- سادە: لەیەك وشەی سەربەخۆ پێکدێت وەك: (خێرا، باش، توند، پاك، چاك، گورج، ئازا، .......)

٢- دارێژراو: لە وشەیەکی سادە و زیادەیەك پێکدێت، زیادەکە یان پێشگرە یان پاشگرە یان هەردووکیان پێکەوە دەبن وەك: (بەپەلە، بەسواری، شێرانە، بەباشی، بەئازادی، ......)

٣- لێکدراو: لە دوو وشە یان زیاتر پێکدێت وەك: (بەدڵ شکاوی، پشتاوپشت، سەربەرزانە، بەدڵسۆزی .......) ئەگەر هاوەڵکاری چۆنیەتی وەسفی ناوێك، جێناوێك یان هاوەڵکارێك بکات ئەوا دەبێتە هاوەڵناو و نابێتە هاوەڵکار وەك: (چرایەکی باش لە دەی خراپ چاکترە).

لەم ڕستەیەدا وشەی (باش، خراپ، چاکتر) هاوەڵناون چونکە پەسنی ناوێك دەکەن، هەرچەندە سێیەمیان (چاکتر) دەبێتە تەواوکەری کارە ناتەواوەکە پەسنی بکەر دەکات کە چرایەکەیە.

هاوەڵکاری چۆنیەتی سادە، وەکو وشەیەك دەبێـە تەواوکەری واتای کاری ڕستەکە و بۆ ئەم تەواوکردنە پێویستی بە ئامرازی تەواوکردن نییە، بەڵام هاوڵکاری چۆنیەتی داڕێژراو، لێکدارو وەکو گرێیەکی هاوەڵکاری چۆنیەتی دەبنە تەواوکەری کاری ڕستەکانیان.

**دەستوور:**

**هاوەڵکاری چۆنیەتی لەناو ڕستەدا (وشەیەکە، یان گرێیەکی هاوەڵکاری)یە چۆنیەتی ڕوودانی کاری ڕستەکە دەردەخات و لەم ڕووەوە دەبێتە تەواوکەری واتای کارەکە.**

**هاوەڵکاری چۆنیەتی، سادە، داڕێژراو، یان لێکدارو ئەگەر پەسنی ناوێك، جێناوێك بکەن دەبنە هاوەڵناو بەڵام ئەگەر چۆنیەتیی ڕوودانی کارێك دەربخەن دەبنە هاوەڵکاری چۆنیەتی.**

## ڕاهێنان ( ١ )

ئەم وشانەی خوارەوە لە ڕستەدا بەکاربهێنە بەمەرجێك جارێك ببنە هاوەڵناو جارێکیش ببنە هاوەڵکاری چۆنیەتی: (بەگورجی، خراپ، بەسەربەستی، زۆر بەپەلە، بەهێواشی، گەورە).

## ڕاهێنان ( ٢ )

ئەم وشە سادانەی خوارەوە بکە بە هاوەڵکاری چۆنیەتی داڕێژراو.

(هێمن، سارد، فێنك، خۆش، زیرەك، پاك، سەوز، مەرد، تاڵ، چاك)

## ڕاهێنان ( ٣ )

**شیکردنەوە:**

١- ڕۆژنامەکەم بەخێرایی خوێندەوە.

ڕۆژنامەکە: ناوە، تاکە، ناسراوە، گشتییە، بەرکارە.

م : جێناوی کەسیی لکاوە بۆ کەسی یەکەمی تاك، بکەرە.

بەخێرایی: گرێی هاوەڵکاری چۆنیەتییە، تەواوکەری واتای کاری خوێندەوەیە

خوێندەوە: کاری ڕابردووە، تێپەڕە.

٢- ئەم ڕستانە شیبکەوە.

ئـ- چێشتەکە بەگەرمی مەخۆ.

ب- قوتابیی ژیر، ژیرانە وەڵام دەداتەوە.

پ- ئێمە بەدڵسۆزی کار دەکەین.

## (کاری یاریدەدەر)

ئەم ڕستانە بخوێنەوە:

١. دەبوو ئەوان کارەکەیان تەواو بکردایە.

٢. ڕەزڤانی زەڤیاخۆ کێلابوو.

٣. دەبێت چیرۆکەکە بخوێنمەوە.

٤. ڕووداوەکە مرۆڤەکەی هێنایە قیژاندن.

٥. پەرتووکی زمان وئەدەبی کوردی هاتە چاپکردن.

٦. ئەڤـ گوندە دهێتە ئاڤا کرن.

٧. شاسوار منداڵەکانی خستە پێکەنێن.

٨. ویستم زوو هەڵبستم.

٩. دەمەوێت کتێبەکە بکڕم.

١٠. من دڤێت زوو ژخەو ڕابم.

١١. دەتوانین بەسەر چیاکە بکەوین.

١٢. ئەم دشێین بسەر چیا بکەڤین.

١٣. دەوێرم لەڕووبارەکە بپەڕمەوە.

١٤. دێم بڕۆم ناهێلن.

١٥. دەلێم نهێنییەکە بدرکێنم.

١٦. دەشێت گیرو گرفتەکان چارە بکرێن.

١٧. دەگونجێت ئەوان کتێبەکان بهێنن.

## خستنه ڕوو:

لەمەو پێش زانیومانە کەکاری (دەبوو، دەبێت، بوو، هێنایە، هاتە، دهێتە، خستە، ویست، دەمەوێت، دڤێت، دەتوانین، دشێین، دەوێرم، دێم، دەلێم، دەشێت، دەگونجێت).

هەریەکەیان کارێکی واتاداری سەربەخۆن، دەتوانرێت هەریەکەیان بەتەنیا لەناو ڕستەدا وەکو : کارێکی سەربەخۆی تەواو بەکاربهێنرێت وئەرکی خۆی ببینێت.

بەلاّم لەگەلّ ئەمەش دا دەتوانرێت ئەو کارانەی سەرەوە وەکو کارێکی یاریدەدەر لەناو ڕستەدا بەکاربهێنرێن، کاتێك لەپالّ کارێکی سەرەکی سەربەخۆ یا لەپالّ چاوگێك دێن، کەهەر یەکەیان بۆمەبەستێکە . بۆنموونە :

١- لەڕستەی یەکەم دا کاری(دەبوو) کارێکی یاریدەدەرە، کەبۆ مەبەستی پێویست بەکار هاتووە، کاری (تەواو بکردایە) کارێکی سەرەکییە لەرستەکەداو مەبەست و واتای رستەکەی بەیارمەتی کاری(دەبوو) بەتەواوی ئاشکرا کردووە.

٢- لەڕستەی دووەم دا کاری(بوو) کارێکی یاریدە دەرە، بۆمەبەستی پێکهێنانی کاری ڕابوردووی دوور بەکار هاتووە، بەلاّم کاری(کێلاّ)کارێکی سەرەکییە لەڕستەکەدا وبەیارمەتی کاری یاریدەدەر(بوو) مەبەست ومانای ڕستەکەی بەتەواوی داوە بەدەستەوە.

٣- لەڕستەی سێیەم دا کاری(دەبێت) کارێکی یاریدەدەرە و، بۆمەبەستی پێویست بەکارهاتووە، بەلاّم کاری (بخوێنمەوە)کارێکی سەرەکییە لەڕستەکەداو بەیارمەتی کاری یاریدەدەر(دەبێت) مەبەست و واتای ڕستەکە بەتەواوی دەدات بەدەستەوە.

٤- لەڕستەی چوارەم دا کاری (هێنایە) کارێکی یاریدەدەرە، بەڵام چاوگی (قیژاندن)کە لە شوێنی کاری سەرەکی بەکارهاتووەوجێی ئەوی گرتۆتەوە، بەیارمەتیکاری یاریدەدەر،(هێنایە) مانای ڕستەکەی بەتەواوی داوە بەدەستەوە.

٥- لەڕستەی پێنجەم دا کاری(هاتە) کارێکی یاریدەدەرە، چاوگی (چاپکردن) لەشوێنی کاری سەرەکی بەکارهاتووەو جێی ئەوی گرتۆتەوە، بەیارمەتی کاری یاریدەدەر (هاتە) مانای ڕستەکەی بەتەواوی داوە بەدەستەوە.

٦- لەڕستەی شەشەم دا کاری(دهێتە) کارێکی یاریدەدەرە، چاوگی (ئاشاکرن) کەلەشوێنی کاری سەرەکی بەکارهاتووەو بەیارمەتی کاری یاریدەدەر (هاتە) مانای ڕستەکە بەتەواوی دەدات بەدەستەوە.

٧- لەڕستەی حەوتەمدا کاری (خستە) کارێکی یاریدەدەرە، چاوگی (پێکەنین) کەلەشوێنی کاری سەرەکی بەکارهاتووە بەیارمەتی کاری یاریدەدەر(خستە) مانای ڕستەکەی بەتەواوی ئاشکرا کردووە.

٨- لەڕستەی هەشتەم دا کاری (ویست) کارێکی یاریدەدەرە، بۆمەبەستی ویستن بەکارهاتووە، بەڵام کاری (هەڵبستم) کارێکی سەرەکییە لەرستەکەدا بەیارمەتی کاری یاریدەدەر (ویست)مانای ڕستەکە بەتەواوی ئاشکرادەکات.

٩- لەڕستەی نۆیەمدا کاری (بکرم) کارێکی سەرەکییە وبەیارمەتی کاری یاریدەدەر (دەمەوێت) مانای ڕستەکە بەتەواوی ئاشکرا دەکات.

١٠- لە ڕستەی دەیەم دا کاری (دڤێت) کارێکی یاریدەدەرە، بۆ مەبەستی ویستن بوکارهاتووە ، کاری (ڕابم- ڕابىم) کارێکی سەرەکییەو بەیارمەتی کاری یاریدەدەر (دڤێت) مانای ڕستەکە بە تەواوی ئاشکرا دەکات.

١١- لە ڕستەی یازدەم دا کاری (دەتوانین) کارێکی یاریدەدەرە، بۆ مەبەستی (توانین) بەکارهاتووە، بەڵام کاری (سەربکەوین) کارێکی سەرەکییە و بەیارمەتی کاری یاریدەدەر (توانین) مانای ڕستەکە بە تەواوی ئاشکرا دەکات.

١٢- لە ڕستەی دوازدەمدا کاری (دشێین) کارێکی یاریدەدەرە، بۆ مەبەستی (توانین) بەکارهاتووە ، بەڵام کاری (سەربکەڤین) کاریکی سەرەکییەو بەیارمەتی کاری یاریدەدەر (دشێین) مانای ڕستەکە بە تەواوی دیاردەخات.

١٣- لە ڕستەی سێزدەمدا کاری (دەوێرم) کارێکی یاریدەدەرە، بۆ مەبەستی وێران و ئازایەتی بەکارهاتووە، بەڵام کاری (بپەڕمەوە) کارێکی سەرەکییەو بە یارمەتی کاری یاریدەدەر (دەوێرم) مانای ڕستەکە بە تەواوی ڕوون و ئاشکرا دەکات.

١٤- لە ڕستەی چواردەهەم دا کاری (دێم = دەهێم) کارێکی یاریدەدەرە بۆ مەبەستی ئارەزوو یا نیاز بەکارهاتووە، بەڵام کاری (بڕۆ) کارێکی سەرەکییەو بە یارمەتیی کاری یاریدەدەر (دێم) مانای ڕستەکە بە تەواوی ئاشکرادەکات.

١٥- لە ڕستەی پازدەهەم دا کاری (دەڵێم) کارێکی یاریدەدەرە بۆ مەبەستی نیاز بەکارهاتووە، بەڵام کاری (بدرکێنم) کارێکی سەرەکییە و بەیارمەتی کاری یاریدەدەر (دەڵێم) مانای ڕستەکە بە تەواوی ئاشکرا دەکات.

١٦- لە ڕستەی شازدەهەم دا کاری (دەشێت = دشیان) کارێکی یاریدەدەرە، بۆ مەبەستی شیان و توانین بەکارهاتووە، کاری (چارە بکرێن) کارێکی سەرەکییەو بەیارمەتی کاری یاریدەدەر (دەشێت) مانای ڕستەکە بە تەواوی ئاشکرادەکات .

١٧- له ڕستەی حەڤدەهەم دا کاری (دەگونجێت) کارێکی یاریدەدەرە، بۆ مەبەستی گونجان بەکارهاتووە، کاری (بهێنن) کارێکی سەرەکییەو بەیارمەتی کاری یاریدەدەر (دەگونجێت)مانای ڕستەکە بە تەواوی ئاشکرادەکات.

## دەستوور:

**کاری یاریدەدەر: ئەو کارەیە کەلە ڕستەدا لەپاڵ کارێکی سەرەکیی سەربەخۆ یا چاوگێك دێت، بۆ دیارکردنی مەبەستێك و دەبێتە هۆی تەواوکردنی مانای کارەکە یا چاوگەکە.**

**کاری یاریدەدەر ئەمانەن : (دەبوو، دەبێت، بوو، هێنایە( ئینایە)، هاتە، دهێتە، خستە، ویست، دەوێت، دڤێت، دەتوانی، دشێن، دەوێرم، دێ، دهێت، دەڵێی، دەشێت، دەگونجێت، دەلوێت، دا، دابوو، ددا، دایە).**

**وەك :گۆڤاردابوو خاندن، دەرگەه داگرتن.**

### ڕاهێنان ( ١ )

ئەم ئەم کارە یاریدەرانەی خوارەوە لە ڕستەدا بەکاربهێنە .

(دەتوانین، دەبوو، دەگونجێت، دەوێرم، دەڵێم، دهێتە، هاتبوو)

### ڕاهێنان ( ٢ )

ئەم کارانەی خوارەوە لە ڕستەدا بەکاربهێنە ، بەمەرجێك جارێك کاری سەرەکی بن و جارێك کارێکی یاریدەدەر بن.

(دەبێت، دەمەوێ، هێنایە، دڤێت، خستە، دهات، دەبوو)

## ڕاهێنان ( ٣ )

ئەم ڕستانەی خوارەوە شلۆڤە بکە (شی بکەوە)

١- دەبێت ڕۆمانەکە بخوێنمەوە.

٢- دەمەوێت پارەی هەژارەکە بدەم.

## ڕاهێنان ( ٤ )

پارچە پەخشانێك لەسەر ئەم بابەتەی خوارەوە بنووسە، ئینجا هەرچ کاری یاریدەدەر هەبێت دیاری بخە.

(مانگی ئادار، مانگی خۆشی و ناخۆشییە، مانگی سەرکەوتن و کارەساتە).

## (خاڵبەندی)

**- چۆن کات دەزانیت؟**

**- ئەمە کارێکی ئاسانە.سەیری سەعاتەکەت بکەو بزانە کات چەندە؟**

**- باشە.ئەی لەپێش ئەوەدا سەعات دابهێنرێت چۆن کات دەزانرا؟**

**- بەئاو دەزانرا.**

**- بەئاو!چۆن چۆنی؟**

**- ئاویان دەکردە ناو دەفرێکەوەو کونێکی بچووکیان دەکردە بنی دەفرەکە، ئاوەکە بەڕێکوپێکی تنۆك تنۆك لەکونی دەفرەکەوە دەهاتە خوارێ ئینجا بەپێی ئەو ئاوەی کەلەدەفرە کونکراوەکە دەهاتە خوارەوە دەزانرا کات چەندە.**

*　　*　　*

لەو ئاخاوتنەی سەرەوەدا، کەڕستەی ((چۆن کات دەزانیت؟)) دەخوێنینەوە، پێویستە دەنگمان وەها دەربڕین کە پرسی تێدابێت. وە کەڕستەی (ئەمەکارێکی ئاسانە)ش، دەخوێنینەوە، دەبێت دەنگمان وەها دەربڕین کەڕاگەیاندنی تێدابێت، هەروەها کەڕستەی ((بەئاو)) دەخوێنینەوە دەبێت دەنگمان وەها دەربڕین کەسەرسوڕمانی تێدابێت.ئنجا لەدوای ئەمە ئەگەر سەیری کۆتایی ڕستەی یەکەم بکەین ئەم نیشانەیە (؟) دەبیبنین، کەنیشانەی پرسە. وە ئەگەر سەیری کۆتایی ڕستەی دووەم بکەین ئەم نیشانەیە (.) مان بەرچاو دەکەوێت، کەنیشانەی کۆتایی ڕستەیە. وەئەگەر سەیری کۆتایی ڕستەی سێیەم بکەین،ئەم نیشانەیەی (!) تێدا دەبینین کە نیشانەی سەرسوڕمانە . ئەم نیشانانە و هەندێك نیشانەی تر کە لەمەولا بەرچاوت دەکەون پێیان دەگوترێت ((خاڵبەندی))

ئەگـەر ئـەم نیـشانانە و لـە جێـی خۆیانـدا بـە وردی دابنـرێن زۆر یاریـدەی خوێندەواران دەدەن، کە بە ئاسانی لەوە بگەن کە دەیخوێنینـەوە و هەڵـەی تێدانەکەین.

وە هەر نیشانەیەك لەو نیشانانە ، نـاوێکی تایبـەتی و جێـی خـۆی هەیـە، لـە ڕستەدا، ئەوا لـە خوارەوەنـاوو جێگـای هـەر یـەکێك لـەو نیـشانانە دەخەینـە بەرچاو.

## یەکەم: خاڵ ( . )

خاڵ ڕاوەستانێکی تەواو پیشان دەدات، وەلەم شوێنەدا بەکاردەهێنرێت :

١- لـە کۆتـایی هـەموو ڕسـتەیەکدا دادەنرێـت، جگـە لـە ڕسـتەی پـرس و سەرسوڕمان وەك:

ئاسۆ برازای منە:

خۆر لە ڕۆژهەڵاتەوە هەڵدێت و لە ڕۆژئاواوە ئاوادەبێت.

٢- لـەدوای یەکـەم، یـا یەکـەم و دووەم پیتـی ناوێـك کـە پـێش ناوهێنـانی خێزانەکەی بکەوێت، وەك:

م. بازیانی.

د. ق. ئامێدی.

## دووەم: دووخاڵ ( : )

دووخـاڵی لەسـەر یـەکتر نیـشانەی لێکدانـەو ڕاڤـە کردنـە وەلـەم شـوێنانەدا بەکاردەهێنرێت :

١- لەپێش ئاخاوتنێکەوە، کە وەك خۆی بگێڕێتەوە ، یا بگوترێت وەك :

نەسرین گوتی (ئەمە چەفتەکەی من نییە)

٢- لەدوای وشەیەکەوە یاباسێکەوە، کەپێویستی بە تەفسیرولێکدانەوە بێت، وەك:

سالْ لە چوار وەرز پێك دێت : بەهار، هاوین، پاییز، زستان.

٣- پێش هێنانەوەی نموونە (لە بری : بۆوێنە، وەکوو، بۆ نموونە .....) بەکاردەهێنرێت لەم بارەدا دەتوانرێت لە دوای دوو خاڵەکەوە، تەقەڵێکیش دابنرێت، وەك :

هاوەڵکار، بۆ تەواکردنی هاوەڵکارێکی تریش بەکاردەهێنرێت:-

شاسوار، زۆرجوان بە عەرەبی دەدوێت.

## سێیەم - بۆر ( ، ):

بۆر نیشانەی کورتترین ڕاوەستانەو لەم شوێنانەدا بەکاردەهێنرێن.

١- لەدوای ناوی بانگ کراوەوە وەك :

کوڕینە، بخوێنن، بە خوێندن دەگەنە ئامانج

٢- لە نێوان جێگرو جیٚ لیٚ گیراودا ، وەك:

ئەحەی ناسر، گۆرانی بێژی بەناوبانگ، لە شاری سلێمانیدا دەژیا.

٣- بۆ جیاکردنەوەی زنجیرە وشەیەك، کە سەر بە بەشێك لە بەشەکانی ئاخاوتن بن لە ڕستەدا بە ئامرازی لێکدەر نەبەستراین بە یەکترەوە، وەك: پارچەکانی ئاخاوتن ئەمانەن : ناو، جێناو، هاوەڵناو، کار، هاوەڵکار، ئامرازی پەیوەندی، ئامرازی لێکدەرو ئامرازی بانگکردن.

٤- بۆدابڕینی زنجیره وشەیەك لەیەكتر، كەدوو دووپێكەوە بەكارهێنرابن، وەك:

جووتیار بەگەرماو سەرما، بەخۆشیو ناخۆشی، بازووی مەردانەی

لێ هەڵ ماڵیوە، زەوی دەكێڵێت، خۆراك بۆمیللەت دەردەهێنێت .

٥- لەدوای گێڕانەوەیەكی یەكسەر، واتا ئەگەر قسەكەر قسەیەكی كۆنی خۆی بگێڕێتەوە، وەك:

من خۆم گوتم، (دارەكان بەنەمامی مەبڕنەوە).

٦- لەپێش ئامرازی لێكدەری (وە، یا، یان)ەوە، بەمەرجێك نەكەوتبێتنە سەرەتای ڕستەوە، وەك:

نەمن هاتبووم بۆئاهەنگەكە، وەنە شاسواری برام.

قەڵەمەكەتم بدەرێ، یاپاندانەكەت .

٧- لەدوای گرێیەكی درێژ بۆ پاراستنی واتای ڕستەكە لە لەنگی وەك:

دارستانی ئەوبەر ڕووبارەكە لەدارستانی ئەم بەر ڕووبارەكە, چڕترە.

٨- لەدوای وشەی (بەڵێ) و (نەء .....نەخێر)ەوە وەك:

بەڵێ، ئەمە كتێبی منە.

نەء، ئەوە هی من نییە.

نەخێر، دەستە چەورەكەی خۆتان بەسەر ئێمەدا مەشۆن.

٩- لەبڕی كاری قرتێنراو (حەزف كراو)، وەك:

من دەچم بۆمەڕاكش و ئەویش, بۆكوێت.

١٠- بۆدابڕینی پاڕستەی ناوی, هاوەڵناوی، هاوەڵكاری لەشاڕستەكە، لەڕستەی ئاوێتەدا وەك :

ئـ- من نەم بیستووە، كەئێوە هاتبن بۆئێرە.

ب– بەفریٚ، کەلەزستاندا دەباریٚت، لەهاویندا دەتویٚتەوە.

پ– کەی لەئەرکەکەم ببمەوە، سەریٚکتان لیٚ دەدەم.

١١– لەڕستەی لیٚکدراودا، دەتوانریٚت، لەبڕی ئامرازی لیٚکدەری ( و ) بەکار بهیٚنریٚت، وەك :

سیروان ویستی بچیٚت بۆشار، ئەسپەکەی هیٚنا، زینیکرد، سواری بوو، کەوتە ریٚ، لەریٚ باران دای ڕشت، هەرچی لەشی هەیە، تەڕبوو.

١٢– دەتوانریٚت لەبڕی (کە)ی لیٚکدەر لەڕستەدا بەکار بهیٚنریٚت وەك:

پیٚم خۆشە, سەریٚکتان لیٚ بدەم.

کەس ئەو کەسەیە، لەڕۆژی تەنگانەدا فریات دەکەویٚت.

## چوارەم- بۆر و خال (؛):

بۆر و خالٚ وچان گرتنیٚکی دریٚژتر لە وچان گرتنی بۆری سادە. بەکار دەهیٚنریٚت، وەك:

لەکۆمەڵەی فڕۆکەوانی عیٚراقدا فیٚری فڕۆکەوانی دەبین ؛ لەویٚ باسەیری یەکتری بکەین، لەکاتی فڕیندا ؛ باهەریەکەمان هەڵەی ئەوەی تر ڕەچاو بکات، تاکو لەجارانی داهاتوودا، دووبارەیان نەکەینەوە و بەتەواوی فیٚری لیٚخوڕینی فڕۆکەببین.

## پیٚنجەم- نیشانەی پرس(؟) :

نیشانەی پرس دەخریٚتە کۆتایی ئەورستەیەوە کەپرسیاری تیٚدابیٚت، وەك:

بەچی لەڕووبارەکە پەڕیتەوە ؟

کەی گەیشتنە جیٚ؟

### شەشەم: نیشانەی سەرسوڕمان ( ! ) :

ئـەم نیـشانەیە لـەکۆتایی ئـەو وشـانە, یائـەو، ڕسـتانەی، کەسەرسـوڕمانیٚ، یاپەژارەییٚ، یاهەستێکی دەروونی تێدایە بەکاردەهێنرێت، وەك :

چەند درەنگ هاتیت!

ئای!ئەوەلێرەیت!

ئۆخەی! لەدەست دەرەبەگ ڕزگارمان بوو.

سەیری ئەو گوڵەکە، چەندجوانە !

ئای لەو گوڵانە !چەندجوان گەشاونەتەوە !

### حەوتەم- جووتەکەوانەی بچووك (( )) :

ئەم نیشانەیە لەم شوێنانەدا بەکاردەهێنرێت :

١- لەپێش و پاشی وشەیەك, یارستەیەکەوە، کەخوێنـدەوار بەلایـەوە جێـی واق وڕمان بێت، وەیا بویستریٚ سەرنجی خەڵکی بۆڕابکێشرێت وەك :

تەنیا شێوازی ((گۆران))م بەدڵە، لە دارشتنی هۆنراوەدا.

لە باخەکەی ئێوەدا هەر ((شەوبۆکان))م لەلاجوان بوو.

پیاوی دڵسۆز ئەوکەسـەیەکە ((سـوودی بۆمیللـەت هەیـە))و دەستی یاریدە بۆکەسانی تر درێژ دەکات.

٢- لە پێش و پاشی ئەوئاخاوتنەوە دادەنرێت، کەدەقەکـەی ناشکێنرێـت ؛ واتە وەك خۆی بەبیٚ دەستکاری دەگێڕریتەوە، وەك :

هاورێکەم پێمی گووت ((من بەدەرچوونت، وەك گولٚ گەشامەوە)).

باوکم هانی دەدام و دەیگوت ((کوڕم بخوێنە، بەخوێندن دەبیتە پیاو)).

### هەشتەم- جووتە کەوانەی گەورە ( ) :

**ئەم نیشانەیە:**

١- وشەیەك، یاگرێیەك، یارستەیەك دەخرێتـە نێوانی، کەواتایـەکی تاییـەتی هەبێت، لەڕستەیەکی تردا، وەك:

پیرەمێرد (حاجی تۆفیق) شاعیرێکی مەزن بوو.

شاری سلێمانی (کەکەوتۆتە دامێنی چیای ئەزمڕ) سلێمان پاشای بابان دروستی کردووە.

٢- وشەی بێگانە، وەك:

شارەوانی (بلدیە) خزمەتی گەل دەکات.

میری (حکومەت) لەگەلەو بۆکەلە.

٣- سالّی لەدایك بوون، وەك :

جەمیل سائیب لەسالّی (١٩٢٥)دا چیرۆکی (لەخەوما)ی نووسیوە.

## نۆیەم: هێلّ، یاتەقەلّ:-

ئەم نیشانەیە لەم شوێنانەدا بەکاردەهێنرێت :

١- بۆجیا کردنەوەی دووکەسی گفتوگۆکەر، وەك:

لەمالّەوە دانیشتبووم، قادری هاوڕێم هات و گوتی:

- دوو ڕۆژە دیارنیت ؟

- نەخۆش بووم و لەجێدا کەوتبووم.

- ئەی ئێستا چۆنیت ؟

- باشم

٢- دەتوانرێت لەبڕی ئەو دووکەوانە گەورەیە بەکاربهێنرێت، کەوشەیەك، یاگرێیەك، یاڕستەیەك (کەواتایەکی تایبەتی هەیە لە ڕستەیەکی تردا) بەکاردەهێنرێت، وەك:

بیابانی گەورەی ئەفریقا (وەکو بیستوومە) ڕووبەرێکی پانی هەیە لە نیشتمانی عەرەبدا.

٣- له نێوان ژماره و ژمێرراودا، ئەگەر کەوتنە سەرەتای ڕستەوە، وەك: لە ئەنجامی هەموو سەرکەوتنێکدا :

ئـ- زۆر خەستەخانەو مەڵبەندی ساوایان دەکرێنەوە.

ب- گەلێ شارو دێهاتی نوێ دروست دەکرێن .

پ- باری ئابووری ولأت سەرلەنوێ جێگیر دەبێت.

ت- ئاسایش باڵ بەسەر ولأتدا دەکێشێت.

٤- له کۆتایی دێردا- ئەگەر نەتوانرا جێی نووسینەوەی هەموو بڕگەکانی وشەی دواییني ڕستەکەی بە تەواوی تێدا بکرێتەوە، بۆ وێنە ئەگەر جێ نەماو وشەی (هەنارەکە) هەمووی لە دێڕێکدا بنووسرێ، هێڵێکی بچووك لەدوای ئەو بەشەیەوە دادەنرێت، کە دەتوانرێت لە دێرەکەدا بنووسرێت، ئەو بەشەش یەکێ لەمانە دەبێت:

__هە__________

نارەکە________

هەنا__________

رەکە_________

__هەنارە______

که__________

## دەیەم- چەند خاڵێك ( ....... ) :

ئەم نیشانەیە، لەم شوێنانەدا دادەنرێت، کەوشە، یاگرێ، یا ڕستەی تێدا قرتێنراوە (حەزف کراوە)، بەنیازی کورتکردنەوە ، دەربڕینی تەنیا گرنگەکانیان، وەك :

١- لەگەڵ مامۆستاکانمان چووین بۆ سەیران، لەوێ دەستمان کرد بە یاری و مەلەکردن و ............ ئێوارێ بە خۆشی و شادی، گەڕاینەوە بۆ ماڵێ.

٢- ئەگەر بخوێنیتەوە، دەردەچیت، ئەگینا .......

٣- ئیستیعمارمان بە خۆی و ..........لە عیراقدا شاربەدەر کرد.

**دەستوور:**

خاڵبەندی، یا دانانی خاڵ و نیشانە، لە نێوان بەشەکانی ئاخاوتن دا، لەکاتی نووسیندا، بۆ جیاکردنەوەیان لە یەکترا، یابایەخدان بە دەربڕینی دەنگ و سۆز، لەکاتی خوێندنەوەدا، کارێکی گرنگ و پێویستە. خاڵبەندی پەیوەندیەکی بەهێزو فرمانی هەیە بە خوێندنەوەو، واتای ئاخاوتنەو چونکە هەرباسێك، لە کۆمەڵە بڕبڕەیەك (فەقەرە) پێك هاتووە, هەموو بڕبڕەیەکیش، لە کۆمەڵە ڕستەیەك پێك هاتووە، ئەم ڕستانەش، هەندێکیان سادەو سەربەخۆن، یا هەندێکیان چونەتە پاڵ یەکتر، یا ئاوێتە بەیەکتر بوون وەیا جاری ئەوتۆ هەیە، ڕستەیەك، لەناو ڕستەیەکی تردا دەبینرێت، کەواتاکەی سەر بەڕستەیەکی ترە, بێجگە لەمە، ڕستە لە چەند وشەیەکی جۆراو جۆر سازدەبێت و نووسەر دەیەوێت ئەو پەستیە، یاشادیە، یاهەر کارێکی تری دەروونی خۆی بەو وشانە دەربڕێت, وەیا بوخرێتە کەسێك، وەیا پرسێك بکات، ئەم خاڵبەندیە، واتە ئەم نیشانانەی، کەلێیان دواین، باشترین هۆن بەدەست نووسەرەوە، کەلە نووسیندا، هەستی دەروونی خۆی پێ یان دەربڕێت، هەروەها بەدەستی خوێنەرەوە، کەهەڵە لە خوێندنەوەدا نەکات, وەنیشانەکانیش ئەمانەن:

**١- خالْ، بەم شێوەیە وێنەی دەکێشرێت ( . ).**

**٢- دوو خالْ، بەم شێوەیە وێنەی دەکێشرێت ( : ).**

**٣- بۆر، بەم شێوەیە وێنەی دەکێشرێت ( ، ).**

**٤- بۆرو خالْ، بەم شێوەیە وێنەی دەکێشرێت ( ؛ ).**

**٥- نیشانەی پرس، بەم شێوەیە وێنەی دەکێشرێت ( ؟ ).**

**٦- نیشانەی سەرسوڕمان، بەم شێوەیە وێنەی دەکێشرێت ( ! ).**

**٧- جووت کەوانەی بچووك بەم شێوەیە وێنەی دەکێشرێت (( )).**

**٨- جووت کەوانەی گەورە، بەم شێوەیە وێنەی دەکێشرێت (  ).**

**٩- هێڵ یان تەقەڵ، بەم شێوەیە وێنەی دەکێشرێت (_____).**

**١٠- چەند خاڵێ بەم شێوەیە وێنەی دەکێشرێت (........).**

## ڕاهێنان ( ١ )

ئەم ڕستانەی خوارەوە، کەخالْ و، دووخالْ و بۆریان کەمە، بۆیان دابنێ؛ بە مەرجێك هەریەکەیان ، لە شوێنی خۆی دابێت.

١- مانگی دەستکرد، لە داهێنراوە سەرسوڕهێنەرەکانە ، جا ئەگەر بۆ مەبەستی ئاشتی بەکاربهێنرێت ، ئەوا خزمەتی مرۆڤایەتی دەکات بەوەی ولأتانی گێتی ، بەیەکەوە، بە تۆڕێکی بێتەلْ ببەستێتەوەو بەرنامەی تەلەفزیۆن و شتی ترش، لە ولأتێکەوە بگوێزێتەوە، بۆ ولأتانی تر،

ب- مانگ لە خۆر نزیکترە لە ئێمەوە.

ج- بازاڕەکەمان لێ نزیك بوو خانووەکەی ئێمە لەپشت بازاڕەکەوە بوو بۆیە هەرچیمان پێویست بوایە بەئاسانی دەمانکڕی.

د- شەقامە گەورەکانی بەغداد ئەمانەن : شەقامی ڕەشید ، شەقامی کیفاح ، شەقامی جەمهوری.

## ڕاهێنان ( ٢ )

ئەم ڕستانەی خوارەوە کەنیشانەی پرسو سەرسوڕمانیان کەمە، بۆیان دابنێ:

ئـ- گەزی چی و جاوی چی

ب- مانگ کەی دەردەکەوێت

پ- ئافەرم بۆخۆت و دەستی ڕەنگینت

ت- کە لە قوتابخانە گەڕایتەوە، کتێبەکانت دەخەیتە کوێ

ج- ڤیان لەخۆشیدا هاواری کردو گوتی: بابە گیان بەیەکەم دەرچووم

چ- بەچی دەچیت بۆبەغداد

ح- قسەی هیچ ،ئەمەکەی ئەوەیە ، کەمن دیم

خ- دەنگ چۆن بەتەلی تەلەفۆنەوە دەبیسترێت

## ڕاهێنان ( ٣ )

ئەم پەخشانە بخوێنەرەوە، لەپاشابزانە لەکوێدا هێڵو کەوانەی گەورەو کەوانەی بچووك، وەیا هەرنیشانەیەکی تری گەرەکە، بۆی دابنێ:

ئازاد گوتی: گەلێك باسی زانستی دەخوێنین؛ باسی خۆرگیرانو هەیف گیران یەکێکە لەو باسانە, خۆرگیران و هەیف گیران لەهەموو مانگێکی هەیڤیدا ڕوونادەن وەك هەندێك بەبیریاندا دێت, چونکە خولگەی هەیف بەدەوری زەویدا لەگەل خولگەی زەوی لەدەوری خۆر، جووت نابن و بەگۆشەیەکی بچووك لێی لارە, لەبەرئەوە کە هەیف بەبەینی زەوی و خۆردا تێدەپەڕێت بەزۆری بەسەریان خوار ئەو هێڵە دەکەوێت کەبەچەقی هەردووکیاندا تێدەپەڕێت, لەبەرئەوە، لەم بارەدا نەهەیفو نەخۆر هیچیان ناگیرێت تانەکەونە سەر ڕێکی ئەوهێڵە.

مام هۆمەر پرسی: ئەی باسی فڕینی فڕۆکە ناخوێنین ؟

-ئازاد گوتی: بەڵێ خوێندوومانە, ئەگەر لەفڕگەیەك نزیك بیتەوەو چاوت بەفڕۆکەیەکی پەروانەدار بکەوێت, کەئەمە سادەترین جۆری فڕۆکەیە- ئەمانەت بۆدەردەکەوێت, پێشەکەی پەروانەیەکی پێوەیە باڵەکانی درێژن و سەر ڕووی خوارووی باڵەکانی تەختەو لەگەڵ باری ئاسۆییدا کەمێك لارە, بەلآم سەر ڕووی ژووروی لارو کەوانەییە.

مام هۆمەر گوتی: ئای! ئێمەمانان نەشارەزاین.

## ڕاهێنان ( ٤ )

ئەم هۆنراوەیەی مامۆستا ((گۆران)) بخوێنەرەوە، لەپاشدا بەپێی پێویست نیشانەی خاڵبەندی بۆ بەکاربهێنە.

بەڕەنگی زەردو شێوەی دەستی شمشاڵی کزا دەروێش
حەزم کرد بەستەیەك ببیەم سەراسەر حوزن و ماتەم بێ
لەسیماتا بەدیم کرد هەیکەلی عومرێکی حەسرەتـــــکێش
وەهادیارە کەبەختت ئاشیانی بلبلی خەم بـــــــــێ
بەڵێ دیارە لەناو قەومی بەسیتا قەدری سینعەتـــــکار
وەکو عەکسی قەمەر وایە لەناو حەوزێکی لێخنــــــــدا
بەلآم تەختی ڕەفاه وتاجی حورمەت میللەتی هوشـــیار
بەئوستادی دەدا وەك تۆ لەناوشمشاڵی کون کونــــدا
سەحەر بێنێتە گریانو قسە، سیحری پەری نەغمـــــە
برای دەروێش دەزانم بۆمەعیشەت وێڵ و ئـــــاوارەی
بەزەهری ناعیلاجیتە لەناکەس ویستی لوقمــــــــە

بەمردنتە کە گوێی ناشی ئەخنکێنیٚ خرۆشی نـــــەی

بەلاٚم چیبکەین لەناو چاوی ڕەشی بەعزیٚ زەکای گــەورە

وەکو تۆوی گوڵی دەم با لەسەر بەردێکی ڕەق دەڕۆیـــن

ئەگەر خولقت نەسیبی عومری تۆی مەحکومی ئەم دەورە

نەکردایە خوا عالم لەکام عەرشت دەسوو داوێـــــــن

نەحەرفی مەکتەبێکت خوێند نەئوستادیٚ پەلی گرتـــیت

سرف بەرزی زەکا ئەم سنعەتەی فێرکرد بەشمشـــاڵت

هەموو وەزنێکی گۆرانی لەتوولاتی هەتاکـــــــــورتی

بەسەر پەنجەی هونەر کردت بەدیلی کۆشـــــشی زاڵت

ئەوەندەم بیست لەمۆسیقا خرۆشی ڕۆحی بێـــــگانە

مزاجی کوردەواریم تێك چووە دەروێش عەبـــــــدوڵلاٚ

دەخیلت بم دەسابەولاووك و ئای ئای و حـــــــەیرانە

شەپۆڵی زەوقی میللی پڕ دەروونی مات و چۆڵـــم کە

لە بیتهۆڤن گەلیٚ زیاتر بەرۆحم ئاشنای وەلـــــــلاٚە

دەئەی دەروێش سکالاٚیەك لەگەڵ ڕۆحی کـــلۆڵم کە



## (بابەتەکانی بەشی ئەدەب)

١- داستانی کوردی (قەڵای دم دم)

٢- ڕێبازە ئەدەبییەکان- ڕێبازی کلاسیزم

٣- ئەدەبیاتی کلاسیزمی کوردی- شێوەی لوڕی

٤- ئەدەبیاتی کلاسیزمی کوردی- شێوەی گۆران

٥- ئەدەبیاتی کلاسیزمی کوردی- شێوەی کرمانجی ژووروو

٦- ئەدەبیاتی کلاسیزمی کوردی-شێوەی کرمانجی خواروو

٧- سەرەتای پەخشانی کوردی.

٨- مێژووی ڕۆژنامەگەری و پەیوەندی بەگەشەسەندنی پەخشانی کوردییەوە.

## بابەتەکانی بەشی نموونەی ئەدەب

١- حەسیب قەرەداغی

٢- مەلایێ باتەیی

٣- کوردی

٤- کانی

٥- مەلا تەهایێ مایی

٦- کامەران موکری

٧- مەلامەحموودێ بایەزیدی

## ١- داستانی كوردی
## قەڵای دمدم

سەرچاوەكانی مێژوو بەدرێژی باسی ئەو ڕووداوە گرنگەی ساڵی (١٦٠٨) یان كردووە، لەڕووی گێڕانەوەی مێژووییەوە بەئاسانی دەتوانین لە سەرچاوە فارسیی و كوردییەكاندا بۆ ڕاستیی ئەم قارەمانیی و بەكۆمەڵ شەهید بوونەی كوردانی سەرشۆڕنەكەر بگەڕێین قارەمانانی قەڵای دم دم بە سەركردەیی (خانی لەپ زێڕین) تا دوا هەناسە و دوا دڵۆپی خوێن لەگەڵ داگیركەردا جەنگین و بەكۆمەڵ مردنیان لەسەرشۆڕكردن بە باشتر زانی، ئەم تابلۆ گەورەیەی قارەمانییەتی لە ئەدەبیاتی كوردیدا زۆر بە فراوانی ڕەنگی داوەتەوە، ئەگەر داستانەكانی تر هەندێكیان لە داستانی فۆلكلۆرەوە گۆڕابن بە داستانی نووسراوەی شیعر ئەوا داستانی قەڵای دمدم لە ڕووداوی مێژووییەوە بووە بە داستانی فۆلكلۆر و لە داستانی فۆلكلۆرەوە بووە بە چیرۆكی سەر شانۆ و ڕۆمانی تازە، لە سەرەتای سەدەی حەڤدەهەمەوە تا ئەمڕۆ پاڵەوانییەتیی جەنگاوەرانی قەڵای دمدم لەسەر دەمی گۆرانیبێژ و حیكایەتخوانانی كوردەوەیە و لە هەموو ناوچەكانی كوردستاندا و بەهەموو دیالێكتەكانی كوردی دەگێڕێتەوە.

ئەو بەرهەمە فۆلكلۆرییەی ئازایی جەنگاوەرانی قەڵای دمدم هێنایە كایەوە، گەلێك زۆرە هەندێكی بڵاوكراوەتەوە، بەشێكی تائێستا هەر بەسەر زاری خەڵكەوە ماوەتەوە، ڕۆژهەڵاتناسەكان گەلێك لە ئێمە زیاتر بایەخیان بە حیكایەت و بەیتەكانی قەڵای دمدم داوە، هەروەك بڵاویان كردۆتەوە و كردووشیانە بە ڕووسی و ئەڵمانی و فەڕەنسی و ئەرمەنی، هەروەها كراویشە بە فارسی.

زانای کوردی سۆڤیەتی (ئۆردوخانی جەلیل) چەند گێڕانەوەیەکی داستانی قەڵای دمدمی تۆمار کردووە و بە وەرگێڕانی ڕووسی و پێشەکییەوە ساڵی ١٩٦٧ بڵاوی کردووەتەوە.

ئەم داستانە لە کوردستانی عیراق لەشێوەی چیرۆکی سەر شانۆدا نووسراوەتەوە، نووسەر (مستەفا سالح کەریم) لەسەر بناغەی کەرستەی مێژوویی پیەس (شەهیدانی قەڵای دمدم)ی نووسیوە لە ساڵی ١٩٦١ چاپکراوە، هەر کەرستە مێژوویی و فۆلکلۆرییەکەیە بووە بە سەرچاوە بۆ دانانی چیرۆك و ڕۆمانی کوردیش. نووسەری گەورەی کوردی سۆڤیەتی (عەرەبی شەمۆ) ڕۆمانێکی نووسیووە ساڵی ١٩٦٦ بە زمانی کوردی و پیتی ڕووسی (سلاڤی) لە (یەریڤان) چاپکراوە. لەپاشاندا کراوە بە ڕووسی و لە ساڵی ١٩٦٩ لە مۆسکۆ چاپکراوە، عەرەبی شەمۆ هەوڵی داوە پەیوەندی دۆستایەتیی کورد و نەتەوە هاوسێکانی ڕوونبکاتەوە، بەتایبەتی خەباتی ئەم گەلانە بەرامبەر بە داگیرکەری ئێرانی و عوسمانی، هەوەرها وێنەی نایابی ژیانی کۆمەڵایەتی و ئابووری کوردستانی سەرەتای سەدەی حەڤدەهەمی کێشاوە.هێشتا ئەم داستانە مەزنە نە لە ئەدەبیاتی کوردیدا و نە لە ئەدەبیاتی جیهاندا جێگەی خۆی نەگرتووە.

١- لە گێڕانەوەیەکی داستانەکەدا (ئەمیر خانی لەپ زێڕین) کە سەرکردەی کورد بوو، هاواری مەردانەی بەرامبەر بە (شا عەباس) بەرز دەکاتەوە و دەڵێت:

**خەلقێ مە نایێ ڕایێ**
**هیڤیا دووژمنا ل مەیدانێ**
**مینا شێرا ئەو شەڕ دکە**

هەرتـم، دوژمنـان لـەت دكـە
مـە نەخۆفیٚ عەسكـەریٚ تـــە
مە نەخۆفیٚ خانـی تەوریٚــزیٚ
كەلـیٚ ڕانــاكـا ژ هەمبیٚــزیٚ
مە نەترس خانیٚ چین ماچینـیٚ
قڕناكــە خەلقــیٚ مـــە
مە نەخۆفیٚ خانیٚ تە یمورییـا
بەلا ناكا خەلقیٚ مە لە چیــا
تــاجیٚ تە قبــول ناكــەم
... ... ... ...
كوردستـانیٚ بیٚ نـاڤـ ناكــەم

(بۆ لەبەركردنە)

**لێكدانەوەی وشەكان:**

نایێ ڕایێ: نایێتە سەر ڕێ (واتە: بۆ شا عەباس)

هیڤی: هیوا، بەهیوا، بەتەما

مینا: وەكو

شێرا: شێران

هەرتم: هەردەم، هەركات

كەلێ: نێر

هەمبێز: بەرامبەر، مەیدان

قڕناكە: لەناونابات

بەلا ناكا: لەناوناچێت

بێ ناڤ:   بەدناو.

نموونەیەکی تر لە گێڕانەوەکی تری داستانەکەدا بەشێوەی موکریانە.

حیکایەتخوان دەڵێت:

**خان ئەودالٚ و کاکە خانە**
**حەوت شەوانە و حەوت ڕۆژانە**
**شەڕیان دەکرد بە شیرانە**
**شیران نەیاندیت کێلانە**
**لەش کەوتن وەکی گردانە**
**خوێن ڕۆیی هەروەك جۆگانە**
**باڵچووغەی شێران نەمانە**
**شەهیدیان کرد کاکە خانە**
**خان دەلێ: خانی خەزا یمە**
**هەتا لە دنێ ئەز بژیمە**
**بۆ خۆم پەرژینی شەڕیمە**
**خان ئەودالٚ و کاکە خانە**
**گرتبوویان وەعدە و پە یمانە**

(هەمووی بۆ لەبەرکردنە)

## لێکدانەوەی وشەکان:

بەشیرانە: به شمشێران

کێلان: کێلانی شمشێر

گرد: گر

جۆگە: جۆه، ڕووبار

باڵچووغە: ڕەزمگا، شوێنی شەڕ، شەڕگە

خەزا: غەزا، جەنگی پیرۆز

دنیٚ: دنیا

ئەز: من

# ڕێبازە ئەدەبییەکان

## ڕێبازی کلاسیزم:

ڕێبازە ئەدەبییەکان بۆ یەکەم جارلە ئەورووپا پاش سەردەمی ڕاپەڕین لە دەوروبەری سەدەی حەڤدەمی زاییندا سەریان هەڵدا، لەناو ئەو ڕێبازە ئەدەبیانەش دا کلاسیزم کۆنترین ڕێبازە لە پەیدابوونو بڵاوبونەوەو دەسەڵات پەیداکردن لەسەر بەرهەمی ئەدەبیدا. بەرلەو سەردەمە، ئەدەب بە شێوازێکی ئازادانەو خۆکارانە ڕێڕەوی خۆی گرتبووە بەر- کەدیارە لێرەدا ئەدەب زۆر لەو ڕێبازانە کۆنترەو هەرلە زووەوە شاعیران بە شێوازێکی خۆکارانە شیعریان گوتووە، بیٚ ئەوەی هیچ ئاگادارییێکیان لەبارەی ڕێنمایی‌و بنچینەکانی ئەو ڕێبازە ئەدەبییانەوە هەبێت‌و ئەگەر هەر خاسیەت‌و تایبەتمەندییەکی گشتی هەبوبێت کە شاعیران پەیڕەویان کردبێت، ئەوا ئەم پەیڕەوی کردنە لە ئەنجامی هیچ پێکهاتن‌و تێك گەیشتنیٚ نەبووە، بەڵکو شاعیران بە سەلیقەی خۆیان ئەم تایبەتمەندییانەیان دەست نیشان کردووە.

بزافی ڕاپەڕینی ئەورووپا لە مەیدانی ئەدەب‌و هونەردا بووە هۆی لەدایکبوونی یەکەم ڕێبازی ئەدەبی‌و هونەری لە دیرۆکی مرۆڤایەتیدا کەڕێبازی کلاسیزمەو بەشێوەیەکی تایبەت لەماوەی سەدەی حەڤدەمی زاییندا لە وڵاتی فەڕەنسا گەشەی کرد، لە سەدەیەك دا کەبە سەدەی زێڕین دادەنرێت لە مێژووی فەڕەنسا، هەرچەندە پێشتر سەرەتاکانی ئەم ڕێبازە لە ئیتاڵیا پەیدا ببوو، پاشتریش بەرەو ئینگلتەراو ئەڵمانیاو وڵاتە ئەورووپاییەکانی تر پەلی هاویشت.

وشـەی کلاسـیزم لـە (کلاسـیس- classis)ی لاتینییـەوە هـاتووە، کەلـە بنچینەدا بـەمانای یەکەیـەکی (کەشـتیگەل) (١) دێـت، هەرلـەو واتایـەوە، بـۆ یەکەی خوێندن یان پۆلی خوێندن خوازرایەوە.

ناونانی جۆرە ئەدەبێك بـەم نـاوە، ئـەوە دەگەیـەنێت کەئـەو جۆرە ئەدەبـە نـەمرەو بـە درێـژایی ڕۆژگـار بەکـەڵکی ئـەوەدێت کـە بـۆ پـەروەردەکردن‌و فێرکردنی لاوان لە پۆلەکانی خوێندندا بەکاربێت، هەر لەبەر ئەم هۆیەش بـوو کەهەردوو ئەدەبییاتی کۆنی یۆنانی و ڕۆمانی بە ئەدەبێکی کلاسیزم دانـراون چونکە خوێندنی ئەم دوو ئەدەبە لە قوتابخانەو زانکۆکـانی ئـەورووپا جـاران‌و ئێستاش باشـترین هۆکـاربووە بـۆ پـەروەردەکردن‌و ڕوونـاك کردنـەوەی بـیرو هۆشی لاوان، ئەمڕۆش خوێندنی زمـان‌و هـەروەها ئـەدەبیاتی یۆنـانی کـۆن و لاتینی لە زانکۆکاندا بەکلاسیزم دادەنرێت.

کلاسیزم لە ئەدەبدا لاسایی کردنەوەیە، هەربۆیەش بـوو کەئـەو گەشـەکردن‌و بەرەوپێش چوون‌و ڕابوونە ئەدەبییەی کە لە ئەورووپا سەری هەڵدا، هـەمووی لەسەر بنچینەی لاسایی کردنەوەی ئەدەبییاتی یۆنانی‌و ڕۆمانییەوە دامەزراو. هەر ئەم هۆیـەش بـوو وای کـرد کەنووسـەرو ئەدیبـەکانی سـەدەی حەڤـدەم، شان بەشانی ڕەخنەگرانی ئەو سەدەیە زاراوەی کلاسیزم بۆ ڕێبازە ئەدەبییە تازەکەی خۆیان بخوازنەوە

---

کەشتیگەل : ژمارەیەك کەشتی (اسطول) .

ڕێبازی کلاسیزم لای ئەوروپیەکان بەگشتی چەند خاسیەتو تایبەتمەندیێکی هەیەو پابەندە بەچەند ڕێنمایی و بنچینەیێك، کەئەمانەن :

١- چەشە لەئەدەبییاتی یۆنانی و لاتینی وەردەگرێت و تەنانەت ماددە ئەدەبییەکەش هەرزادەی چەشەوەرگرتنە لەم دووئەدەبە . بەکارهێنانی زاراوەی کلاسیزم دەگەڕێتەوە بۆئەوەی کەنووسەرانی سەدەی حەڤدەم هەمیشە چاویان لەوە بووە کەجۆرەئەدەبێکی وا بهێننە کایەوە کەلەبابەتو لەبەهێزیدا شان لەشانی ئەدەبیاتی یۆنانیولاتینی بدات.

٢- ئەم جۆرە ئەدەبە زادەی عەقلە، دیارە گرنگترین سیفەتی عەقلیش میانڕۆییو ئاشکراییە(ڕوونییە) . ئەدەبایتی کلاسیزم چونکە زادەی عەقلە، بۆییێ هەمیشە هەوڵی گەیشتن بەڕاستییە گشتییەکان دەدات، هەرلەبەر ئەم هۆیەش بووە کەبەشی زۆری بەرهەمی کلاسیزم لەئەدەبدا، بەرهەمی شانۆگەری بووە، بەپێچەوانەی بەرهەمی ڕۆمانتیکی کەبەشی زۆری بریتییە لەهۆنراوەی گۆرانی.

٣- گرنگیدان بەداڕشتەو چاك کاری شێوازی نووسین، ئەدەبیاتی کلاسیزم ڕێزێکی زۆر لەبنەماو بنچینەکانی زمان دەگرێت، بەمەش ڕۆمانتیکی جوودادەبێتەوە، چونکە ڕۆمانتیکی لەم بوارەدا هەمیشە ئارەزووی نووکردنەوەو تازەگەری هەیە، بۆ نموونە لەڕۆمانتیکی لەوانەیە وشە بۆمەبەستی ڕەسەنی خۆی بەکارنەهێت، کلاسیزم هەمیشە چاودەبڕێتە ڕەسەنایەتیو جوانی دەربڕینی زمانەوانییەوە، هەرلەبەر ئەم هۆیەشە کەلەزمانی ئەورووپیەکان دا زۆرجار نووسەری بەتوانا لەزمان دا بەنووسەری کلاسیزم ناودەبرێت، بابەرهەمەکەش بەرئەم ڕێبازە نەکەوێت.

٤- ئەدەبیاتی کلاسیزم دەکەوێتە بەرهەندێك بنەماو بنچینەی تایبەت،یەکێك لەوبنەما سەرەکییانە ڕوونی و ئاشکراییە، هەرلەم بارەیەوە ڕەخنەگری فەرەنسایی(بوالۆ) باوەڕی وایە کەهەرشتێك ئەگەر بەڕوونی هەستی پێبکرێت، بەڕوونیش دەکریت دەری ببڕین، بۆیە کلاسیزمەکان لەوباوەڕەدابوون کەهەرناڕوونییەك لەئەدەبدا هەبێت دەگەڕێتەوە بۆ ناڕوونی لەبیرو عەقلی نووسەرەکەی و لەدەسەلاٚت نەشکانی دا بەسەر بابەتەکە، بۆیەئەدەبیاتی کلاسیزم دوژمنی ناڕوونییە.

٥- کلاسیزم لەئەدەب دابەکرداری لاسایی کردنەوەی سروشت دادەنرێت و بەگشتی کلاسیزمەکان بۆچونێکی مرۆڤانەیان هەیە.

ئەمە لە ئەدەبییاتی ئەوروپا، بۆ ئەدەبییاتی کوردیش، دیارە ئەو بەرهەمە ئەدەبیانەی کە دەکەونە بە رئەو ڕێبازەو بە ئەدەبێکی کلاسیزم دادەنرێن، لەبەر ئەو نییە کە چەشەیان لە ئەدەبییاتی ڕۆمانی و لاتینی وەرگرتووە، بەڵکو ئێمەش بە هەندێك لەو پێوەرانەی بۆ ئەدەبییاتی کلاسیزمی ئەوروپا دانراون، ئەدەبیاتی خۆمانی پیَ بپێوینو لەژێر ڕۆشنایی بنەماکانی ئەدەبییاتی کلاسیزمی ئەوروپایی، ئێمەش بەرهەمە کلاسیزمییەکانمان دەست نیشان بکەین

دیارە شاعیری کورد کە شیعری نوسیوە، ئازادانە کارەکەی خۆی کردووە، ئاگای لەوە نەبوە کە ئەو بەرهەمەی دەینوسێت، ڕۆژێك دێت ڕەخنەگران و زانایانی ئەدەبیات بۆیڕیزبەند دەکەنو دەیخەنە بەر یەکێك لە ڕێبازە ئەدەبییەکانەوە بە پێی سیفەتو تایبەتمەندییەکانی ئەو بەرهەمە، بۆیێ ئەمڕۆ ئێمەش دەتوانین بەشێکی ئەو بنەمایانە بکەین بە بنچینە بۆ پۆلێن کردنی بەرهەمە ئەدەبییەکانمان.

## بنەماکانی ئەدەبییاتی کلاسیزمی کوردی:

١- بەشی هەرە زۆری بەرهەمی ئەدەبییاتی کلاسیزمی کوردی هۆنراوەیە، چونکە سیفەتی زاڵ بەسەر ئەو ئەدەبە کلاسیزمەدا شیعرو هۆزانە، کە ئەویش لە شێوەی شیعری ستوونی دایەو بەیەك سەروا (قافیە) هاتۆتە خوارێ.

٢- ئەدەبییاتی کلاسیزمی کوردی گرنگییەکی زۆر بە پتەویی واتا دەدات، ئەدەبێکە کە هەموو کەس ناتوانێت بەئاسانی لێی تێبگات، چونکە کلاسیزم خۆی ئەکادیمیەت و قوتابخانەیە.

٣- یەکیەتی بابەت لەشیعری کلاسیزمی کوردیدا زۆرکەم پێڕەو کراوە، چونکە لەهەریەك دووبەیتێکدا، شاعیر جۆرەبابەتێك باس دەکات.

٤- پەیڕەوانی بابەتی کلاسیزم لاسایی بەرهەمی ئەدەبیاتی پێش خۆیان دەکەنەوە، بەڵام نەك لاسایی کردنەوەیەکی کۆرانە(کوێرانە) ، بەڵکو ڕەچاو کردنو شوێن هەڵگرتنی کۆمەڵە دەستوورو سەرەتایێك سەبارەت بەبابەتو وێنەو شێوەی داڕشتنی شیعر.

٥- شیعری کلاسیزمی کوردی لەسەر کێشی (عەرووزی) عەرەبی دانراوەو تەرازووەکەی ئەوعەرووزانەن کەزمانەوانی بەناوبانگی عەرەب(خەلیلی کوڕی ئەحمەدی فەراهیدی) داینـاوەو، شاعیرانی کلاسیزمی کوردیش هەوڵیان داوە هەموو دەریاکانی ئەم عەرووزانە بەکاربهێنن.

٦- کلاسیزم زیاتر گرنگی بەدیوی دەرەوەو بەڕوخسارو دیمەن دەدات لەوەی کەبەناوەڕۆك دەیدات، گرنگی بەوشەکاری دەدات بەرلەمانا، بەوێنە بەرلەماددە، شاعیرانی کلاسیزم زۆرگرنگیان داوە بە وشەسازیو ڕەوانبێژی، شیعرەکانی (نالی)

بۆنموونە، ئەم دیاردەیە جێگیر دەکەن.

٧- هۆنراوەی کلاسیزمی کوردی بە دەوری چەند مەبەستێکدا دێتو دەچێتو لێیان دور ناکەوێتەوە وەك دڵداریو غەزەل، پێداهەڵدان، لاواندنەوەو.......هتد.

٨- لە ئەدەبیاتی کلاسیزمی کوردیدا، لەبەر بارو دۆخی میللەتی کورد، زۆرجار هۆزانڤانو شاعیرانی کورد بابەتی نەتەوایەتیان خستووەتە ڕوو، کە ئەم دیاردەیە کلاسیزمی کوردی لە ئەدەبیاتی کلاسیزمی جیهانی جیادەکاتەوە، نموونەش هۆنراوەکانی ئەحمەدی خانی و حاجی کۆیی....هتد ئەوانی ترن.

دوای ئەم پێشەکییە لە بابەت کلاسیزمەوە، لە وانەکانی داهاتوودا هەوڵ دەدەین باسێکی ئەدەبیاتی کوردی بخوێنین بە پێی ئەو دیالیکتو شێوە زارانەی کە بەرهەمەکانیان نووسراوەتەوە.

## ئەدەبییاتی کلاسیزمی کوردی شێوەی لوڕی

ئاشـکرایە کەلـەدوای سـاڵی حەڤـدەی کۆچـیدا ئـایینی پـیرۆزی ئیـسلام لەکوردسـتان بلاّوبـووەوە، لەوسـاوە کوردسـتان وەکـو هـەموو شـوێنەکانی دیکـەی ژێـر فـەرمانی ئیـسلام زمـانی عـەرەبی دەسـتی بەسـەردا کێـشاوە، ئەدەبیانی کوردی بەهۆی بارودۆخی نویٚو زمانی سەرکەوتوو ڕووی لەکزی و ئـاوابوون بـوو، چـونکە کـوردیش وەکوهـەموو گەلەموسـوڵمانەکانی تـر بۆماوەیـەکی درێـژ نووسـین و بەرهـەمی ئـەدەبی هـەر بـەزمانی عـەرەبی نووسیوە.

بـەلاّم لەسـەردەمی سـەلجوقییەکان بـەدواوە گەلەموسـڵمانە ناعەرەبـەکان گەڕاونەتەوە زمانی زگماکی خۆیان و بەرهەمی ئـەدەبیاتیان پـیٚ نووسـیوە، دیارە سەردەمی سەلجووقییەکان لـەڕووی مێـژوویی‌و سیاسـی لـە باربووە و پـشتیوانێکی گـەورە بـووەو بۆزیندوکردنـەوەو بوژاندنـەوەی ئـەدەبیاتیان. کوردیش وەکو ئەوان گەڕاوەتەوەسـەر زمـانی خـۆی و وردە- وردە هۆنـەران دەسـتیان کـردووە بـە زیندوکردنـەوەو بوژاندنـەوەی ئـەدەبیاتی کـوردی، سەرەتایەکی تـازە بۆئـەدەبیاتی کـوردی لەسـەردەمی ئیـسلامەتی دەسـتی پێکـرد، هۆنـەران هۆنراوەیـان بـەزمانی کـوردی هۆنیوەتـەوە، بـەلاّم بـەهۆی تەنگو چەڵەمەی ڕۆژگارەوە زۆربەی بەرهەمەکان تێداچوون و فەوتاون.

کۆنترین هـۆنراوەی کـوردی لـەدوای سـەردەمی سـەلجوقییەکان کەمابێتـەوە نەفـەوتابێت، هـۆنراوەی بابەتایـەری هەمەدانییـە، کەبـەزاراوەی لـوڕی گوتوویەتی.

# بابە تایەری هەمەدانی

## ژیانی:

بابە تایەری هەمەدانی یاناسراو بەبابەتایەری عوریانی، هۆنەرێکی بەرزوهەرەگەورەی کلاسیزمی کوردە، ئەم هۆنەرە مەزنەمان زۆرلایەنی ژیانی بەنادیاریو شاردراوەیی ماوەتەوە ، تەنها ئەوەندەی لێزانراوە کەخەڵکی شاری هەمەدان بووە، کەشارێکە سەر بە ناوچەی لورستان. چوار خشتەکییەکانی بەزاراوەی لوڕی گووتوە، پیاوێکی سۆفی و خوا ناس بووە، لەخەڵك دوورکەوتۆتەوە و گۆشەگیری لاپەسەند بووە، بەڵکو بگاتە خۆشەویستەکەی. هەر لەهەمەدان کۆچی دوایی کردووە،گۆڕەکەی لەسەر گردێکە کە کەوتۆتە باکوری ڕۆژاوای هەمەدان، ئێستا ئارامگەیەکی جوانیان بەسەرەوە دروست کردووە.

لەبارەی ژیانییەوە گەلێك کەس لێی دواون و هەر یەکێك بەپێی سەلیقە و بۆچوونی خۆی شتی نووسیوە . بەڵام ژیانی بابە تایەر وەکو ژیانی شاعیرە گەورەکانی تر بەدوورنەبووە لەدەست تێوەردانی مێژووناسانی ئەدەب و ئەوانەی سەرسام و پابەند بوون بەبیروبەرهەمە ئەدەبییەکەی . لەئەنجامدا وادەرکەوتووە کەساڵی لەدایك بوونی پێش نیوەی یەکەمی سەدەی چوارەمی کۆچی نەبووە،

میرزا مەهدی خان گوتارێکی لەبارەی ژیانی بابە تایەرەوە لەگۆڤاری کۆمەڵەی ئاسایی لەبەنگاڵ دا لەساڵی(١٩٠٤)ز بڵاوکردۆتەوە، مێژووی لەدایك بوونی بابە تایەری هەمەدانی بە پێی ئەم چوارینەی خۆیەوە دەرخستووە کە دەڵێت :

**مۆئان بەحروم کە دەر زەرف ئامەدوستوم**
**مۆئان نوقتە کە دەر حەرف ئامەدوستوم**
**بە هەر ئەلفی ئەلف قەدی بەرئایــــــۆ**
**ئەلف قەدوم کە دەر ئەلف ئامەدوستــوم**

(ئەم چوارینە بۆلەبەرکردنە)

واتا من وەکو ئەو دەریایەم کە لە پیاڵەیەکدا دەرکەوتووم. من وەکو ئەو نوختەم کە لە سەری پیتێکدا پەیدا بووم لە دوایی هەر هەزار ساڵدائەلف ئەندامێك دەردەکەوێت ، من ئەو ئەلف ئەندام و باڵا ڕاستەی وەك ئەلفەم کە لە ئەلف یا هەزارەدا هاتومەتە جیهانەوە. ئینجا میرزا مەهدی خان لە دێری کۆتایدا بە پێی ژمارەی ئەبجەد لێکیداوەتەوە کە سالی لە دایك بوونی بابە تایەر دەکاتە (٣٢٦) کۆچی کە بەرامبەر بە (٩٣٨)ز هەروەها سالی (٤٠١) کۆچی داناوە بە سالی مردنی بەلام هیچ بەلگەی بۆ ئەمە نەهێناوەتەوە کە بەرامبەر بە (١٠١٠) ز هەر چۆنێك بێت چەند ساڵێك زووتر یا درەنگتر لە دایك بوبێت نرخی شاعیرێتی بابە تایەر زیادو کەم ناکات ، کە شاعیرێکی سۆفی و خواناسی گەورەی کوردە لە سەردەمی خۆیدا.

**بەرهەمی :-**

ئەو بەرهەمە ئەدەبییەی کە لە بابە تایەرەوە بۆمان بەجێ ماوە و کۆمەلە چوارینەکانێتی کە زۆر بەهێز بوون و جێگەی خۆیان لە ناو دڵ و دەرونی خەڵك دا کردۆتەوەو لەبەریان کردوون ، لە نەوەیەکەوە بۆ نەوەیەکی تر ماونەتەوە یا بلێین گوازراونەتەوە تا گەیشتونەتە سەردەمی چاپ کردن ئینجا لە دیوانێکی بچووك دا چەند جار چاپ کراونەتەوە ، بەلام زۆربەی چوارینەکانی کە لە چاپ دراون دەستکارییکی زۆریان کراوەو وشەی

فارسییان تێکەلاو کردووە ، هەروەها گەلێك چوارینەیان بە ئارەزووی خۆیان داوەتە پاڵ بابە تایەرەوە بۆ ناوبانگیەتی ، هەتا گەیشتۆتە ئەو ڕاددەی کە بابە تایەر هەشتا چوارینەی گوتووە، گەرچی نزیکەی پێنج سەد چوارینە بە ناوی ئەوەوە بلاْو کراوەتەوە ، جگە لە کۆمەڵە چوارینەکانی دوو کتێبی تری بە ناوی (کلمات القصار) و (الفتوحات الربانی فی اشارات الهمدانی) بە زمانی عەرەبی داناوە ، کە لەوانەدا پلەو پایەی بەرزی ئەدەبی و سۆفی و خواناسی ئەومان بۆ دەردەکەوێت.

## ڕوخساری شیعرەکانی:

بابە تایەر ئەو ڕێچکەیەی کە گرتوویەتی، ڕێچکەیەکی سادەی بێ گرێ بووە، ویستوویەتی دەوروبەری خۆی لە هەموو جۆر لە بیرو باوەڕی خۆی تێبگەیەنێت هۆنراوەکانی بە زمانێکی سادەو ساکار بووە، هەمووکەس خوێندەوارو نەخوێندەوار لە هۆنراوەکانی تێگەیشتووە، بە زاراوەی لوڕی پەتی سادە مانایەکی بەرزی دەربڕیوە.

بابەتایەر بەدوای وشەکاریو شێوازی بەتینو وشەی گران نەگەڕاوە، بەڵکو هۆنراوەکانی بە قالبی (چوارینە) دارشتووە، ئەو قالبە لەگەڵ ئەو شتەی کە دەیویست یەك دەگرێتەوە، کە وشەکان سادەبن، کاریگەرین لە دەروونی خەڵکدا، بەئاسانی لەبەر بکرێن.

بابە تایەر شێوازێکی تایبەتی هەبووە، لاسایی کەسی نەکردۆتەوە، شێوازی لە چوارینەکانی وێنەی نەبووە، هۆنراوەی کەس کاری تێ نەکردووە هەرچی گوتویەتی تایبەت بەخۆی بووە، لە داهێنانی خۆی بووە.

کێشی عەرووزی عەرەبی بەکارهێناوە بەلاْم ئاسانترین کێشی هەڵبژاردووە کەلەگەڵ وشە سادەو ساکارەکان گونجاوەو بونەتە تەواوکەری یەکتری، کە کێشی (مەفاعیلون– مەفاعیلون–مەفاعیل)ە کە ئاوازێکی مۆسیقایی خۆشی هەیە.

## ناوەڕۆکی شیعرەکانی:

کاتێــك بابەتــەکانی بابەتایــەر دەخوێنیتــەوە، وات بۆدەردەکــەوێت کەبابەتایـەر هـۆنراوەی بۆکەسێك نـەگوتووە، ستایـشی کەسـی نـەکردووە، تابگاتە پلەو پایەیێك، یان هەندێك شتی دەست بکەوێت، بـەڵکو بۆئـارەزووی دڵی خۆی وتووە، بۆخۆشەویستی خوای گوتووە، هۆنەرێکە سۆفی گەربووە، تاکەشــاعیری کــوردە کەڕێــچکەی ســۆفیگەریەتی گرتــووەو لەســەردەمی پەیـدابوونی سـۆفیگەریەتی ژیـاوە، سـۆفی گەریـەتی چـەندقۆناغێکی هەیـە، پێویستە سۆفیگەر ئەو قۆناغانە ببڕێت تابگاتـە پلـەی تـەواوی، ئەوقۆناغانـە کەبریتین لەوڕێگایانـەی کـە سـۆفیگەرەکان دەیگرنـە بـەرو دەسـت لەهـەموو شـتێکەوە هەڵـدەگرن کەپەیوەنـدی بـەژیانی سـەر ڕووی زەمینـەوە هـەبێت، بەدڵوبــەگیان ڕوودەکەنــە مەبەســتە ســەرەکییەکەیان کەبگەنــە لای خۆشەویـستەکەیان کەخوایـە، ئـەوکات دەگەنـە پلـەی لەناوچـوون لـەخودی خۆشەویستیان ئەمەش هەندێك لەچوارینەکانییەتی.

١- مۆئـان ڕەندەم کەنـامەم بی قەلەنــدەر
نەخون دیروم، نەمۆن دیروم،نەلەنگـەر
چو ڕوز ئایەد بگەردەم گەردی گێتــی
چو شەو ئایەد بەخشتی وا نەهەم سـەر

٢- دلی دیروم زعیـشقت گێج و ویــجە
موژە بەرهەم زەنوم خوونا بەریــجـە
دلی عاشــق بەسـانی چووب تەڕبـی
سەری سووجە سەری خوونا بەریجــە

٣- ئەگەر دل دلبەرو دلــبەر کودوومە
وە گەر دلبەر دڵودل ڕاچە نــوومە
دڵودلــــبەر وەهەم ئاوێتە وینوم
نەزونــوم دل کیەو دلبەر کودوومە

٤- خوشا ئانان کەهەرشامان تەوینون
سوخەن واتــە کەرون واتە نشینون
ئەگەر دەستوم نەوی کایوم تەوینوم
بشــوم ئانان بویــنوم، کەتەویـون

٥- دلــم مەیلی گوڵو باغی تەدیـرە
سەراســەر سینەم داغـی تەدیـرە
بشــوم ئالالە جاڕان دل کەروم شاد
دیــوم ئالالە هـەم داغی تەدیـرە

٦- بەنەوشـەی جوکەناران هەفتەیی بی
ئەلالەی کوهساران هەفتەیـــی بی
مونـادی مــی کەرون شەهرۆ بەشەهرۆ
وەفـــای گولعوزاران هەفـتەیـی بی

(قوتابیـان و خوێنـدکاران تـەنیا دووچـوارینە لەبەردەکـەن ، مامۆسـتا بۆیـان دەست نیشان دەکات).

## لێکدانەوەی وشەکان:

| | |
|---|---|
| مۆ : | من |
| ئان : | ئەو |
| ڕەندەم : | پیاوی پەرپووت= مرۆڤی هەڵوەریای |
| نامەم بی : | ناوم بێی |
| قەلەندەر : | هەژار، ژار |
| خـون : | خوانە |
| مـۆن : | کەسێك ، خزمێك |
| لەنگەر : | پشتیوان ، لایەنگر |
| چـو : | کـە |
| ئایەد : | هـات |
| بگەردەم : | بسووڕێمەوە ، بگەڕێم |
| گێتـی : | جیهان ، دونیا |
| ئامادەستوم : | پەیدابووم ، هاتومەتە دنیاوە |
| زەرف : | پیاڵەیەك |
| دیروم : | هەیـە |
| گیجویجە : | گێژو وێژە |
| مـوژە : | برژانگ |
| بەرهەم زەنوم : | بەیەکدا بنێم |
| خـوونا : | خوێنـاو |
| بریجە : | دەڕێژێ |
| بەسانی : | وەکوو |

چووب : توول، شوول

سووچه : دەسووتێ

کودوومه : کامەیه

چ نوومه : ناوی چییه

ئاوێته : تێکەڵاو

وینـــوم : دەبینـم

نەزونوم : نازانـم

خوشا : خۆزگه، خوزی

ئانان : ئەوانـه

هەرشامان : هەرئێوارەیەك

سوخەن واته کەرون : قسەلەگەڵ تۆدەکەن، دگەل تەدئاخفن

واتەنشینون : لەگەڵ تۆدادەنیشن وا=لەگەڵ،تە=تۆ، نشینون دادەنیشن

نەوی : نەگـات

کایوم : کەبێم، کەئایوم، کەبێم (دێم)

بشـــوم : بچـم

دل کەروم شاد : دڵم شاد بـێ

دیوم : دیتم، من دیت

داغی تەویره : داخی تۆی هەیه، داخاته هەی

جۆکەناران : ڕەخێ جۆی، کەناری جۆگەکان

کۆهساران : ڕۆزانان، کۆستانان

می کەرون : بانگ دەکات

شەهرو بەشەهرو : بازێڕب بازێڕ ، شار بەشار

# لێكدانەوەی مانای چوارینەكان

١- من ئەو ڕەندە بێ پەروایەم كە ناوم قەلەندەرە، نە خوانەیەكم هەیە نانی لەسەر بخۆم، نە شوێنێكم هەیە تێیدا بحەوێمەوە، نەكەسێكم هەیە پشتیوانم بێت و لەنگەرم بگرێت، كە ڕۆژ هات بەدەوری گێتی دا دەگەڕێم، كەشەو هات خشتێك دەخەمە ژێر سەرمەوەو دەنووم.

٢- دڵێكم هەیە كەلە ئەوینت گێژ و وێژە، برژانگ بەیەكدا بنێم خوێناو دەڕێژێت، دلی ئەویندار وەكو تووڵی تەڕ، سەرێكی دەسووتێت و سەرێكی خوێناو هەڵدەڕێژێ.

٣- ئەگەر دڵ دلبەرە، ئەی دڵبەر كامەیە؟ ئەگەر دلبەر دڵە ئەی دڵبەر ناوی چییە؟ دڵ و دڵبەر پێكەوە تێكەڵاوو ئاوێتە دەبینم. نازانم دڵ كام و دڵبەر كامەیە؟

٤- خۆزگەم بەوانەی كە هەر ئێوارەیەك تۆ دەبینن و قسە لەگەڵ تۆدەكەن و لەگەڵ تۆدا دادەنیشن، ئەگەر دەستم نەگات كە بێم تۆ ببینم دەچم ئەوانە دەبینم كە تۆ دەبینن..

٥- دڵم ئارەزووی گوڵو باغی تۆی هەیە، لە سەراسەری سینەمدا داخی تۆی تێدایە، هاتم بچم بۆ جاڕی گوڵاڵە تا نەختێك دڵم خۆش‌و شادبێت، دیم گوڵاڵەش داخی تۆی هەیە.

٦- وەنەوشەی كەناری جۆگەكان هەر هەفتەیەكە، گوڵاڵەی ناوچە شاخاوییەكان هەر حەفتەیەكە جاڕچی شار بە شار بانگ دەكات، دەڵێت: وەفای گوڵعوزاران = ڕوومەت گوڵان = ئەویش هەر حەفتەیەكە.

# ئەدەبییاتی کلاسیزمی کوردی
# شێوەی گۆران

### سەرەتای سەرهەڵدان:

هەندێك لە شارەزایانی ئەدەبی کوردی لایان وایە کە تێکستی شیعری شێوەی گۆرانی کۆنترین تێکستە لە ئەدەبی کوردی دا ، واتە سەرەتای مێژووی ئەدەبی کوردی بە شیعری شێوەی گۆرانی دەستی پێ کردووە ئەگەر چوارینەکانی بابە تاهیری هەمەدانی (٩٣٨-١٠١٠ز) بخەینە ئەولاوە کەبەشێوەی لوڕی نووسراوتەوە، شیعری کوردی شێوەی گۆرانی شیعرێکی ڕەسەن و بەئەسڵ و بنیادە لەڕووی ڕوخسارەوە، بەتایبەتی کێشی خۆماڵی ((برگەیی)) وقافیەی مەسنەوییە لەڕووی ناوەڕۆکیشەوە سێ بابەتی هەبووە:

١- شیعری چیرۆکی یا چیرۆکی شیعری (مەلحەمە)چیرۆکی دلّداری و دەسبازی و حیکایەتی ئەفسانەیی.

٢- شیعری گۆرانی (ویژدانی،کەسی،سرووشت).

٣- شیعری ئایینی یامەزهەبی (ئۆلی)

شێوەی گۆران لەپێش پەیدابوونی ئایینی پیرۆزی ئیسلام زۆر بەلگەو ئامۆژگاری ئایینی پێ نووسراوە هەروەهالەدەوری ئیسلامیش دا گەلێك هۆنراوەی ئایینی جیا جیای سەر بەچەند پەیڕەوی ئیسلامی پێ نووسراوە، ئەم پەیوەندییە کەرەستەیەکی بەنرخ و گرنگ بۆلێکدانەوەی مێژووی ئایین و مەزهەب وتەریقەت لەکوردستان دا پەیدا دەکات وەك دیارە زۆربەی نەتەوە موسلّمانە ناعەرەبەکان پاش بەموسلّمان بوون بۆئەدەبیات نووسین دەستیان لەزمانی نەتەوەیی خۆیان هەلگرت و ماوەیەك زمانی عەرەبی، زمانی خوێندن و نووسین وئەدەبیاتی خوێندەوارانی ئەم نەتەوانەبوو.

لەدەوری سەلجووقییەکان بەدواوە لای هەندێك لەو نەتەوانە زمانی خۆیان هاتە کایەوە،لەلای کورد بەزاراوەی گۆرانی کۆنترین بەرهەمی پاش سەلجوقییەکان کەتائێستا لەبەر دەست دابێت و لە ونبوون ڕزگاری بوبێت ئەوە هۆنراوەکانی (مەلای پەریشان)ە

## ژیان و بەرهەمی مەلای پەرێشان:

ئەو شاعیرە وەك دەردەکەوێت ناوی محەمەدە و خەڵکی (دەینەوەر)ی ناوچەی کرماشانە، وەك هۆنراوەکانی خۆی وامان پیشان دەدەن کە هەندێکیانی لەساڵی (٨٠١) ی هیجری دانووسیوە (کەدەکاتە دەوروبەری ساڵی (١٣٩٨ ی زایینی).

ئەمەش وادەگەیەنێت کەشاعیر لەکۆتایی سەدەی چواردەهەم وسەرەتای سەدەی پازدەهەمی زاینی ژیاوە.

ئەو هۆنراوانەی مەلای پەرێشان تائێستا لەبەر دەست دان هۆنراوەی ئایینی، بەڵکو (مەزهەبین)، بریتین لەستایشی پێغەمبەر (د.خ) هەروەك ئەو کۆمەڵە شیعرەی کەلەم ساڵانەی دوواییدا لەکرماشان چاپکراوە، زۆر بەسۆز چیرۆکی شەهیدبوونی حەسەن و حوسەین دەگێڕنەوە.

**مەلای پەرێشان لەسەرەتای یەکێك لەموناجاتەکانی دەڵێت:**

**١- خودا من بەندەی ناچیزو زەلیـــــل**
**گونام کەسیرەن، تاعەتم قەلیـل**
**٢- چەنیم عەدالەت مەکەرئەی کەریـم**
**ببەخشەم وەلوتف بەفەزلی عەمیـم**
**٣- حەکیمی عەلیم کەس سڕنەزان کەس**
**عەلیی عەزیم، زاتـی وێتەن بــەس**
**٤- لالای وەئیلحاح مـن بکەر قەبـــوولْ**
**یاحەق و عیسمەت فاتیمەی بەتوول**

(هەمووی بۆ لەبەرکردنە)

## لێکدانەوەی وشەکان:

بەندە : کۆیلە ،عەبد
ناچیز : ناچیزە ،خراب
گونام : گوناهم ،گونام کەسیرەن: گوناحم زۆرن
وێتەن : خۆتان
لالا : پاڕانەوە

ئەمە سەرەتایەکی کورت بوو دەربارەی ئەدەبییاتی زاراوەی گۆرانی و پەیدابوون و سەرهەڵدانی ، دواتر زۆر شاعیری گەورەی وەك (مەولەوی) و (مەلای بیسارانی ) و (ئەحمەد بەگی کۆماسی) و (شێخ سیراجەدین) و (مەولانا خالیدی نەقشبەندی) شیعری ئایینی بەرزو سەر بە تەریقەی نەقشبەندییان بەم زاراوە نووسیوەتەوە ، لە ناو شیعرەکانی شاعیرانی

زاراوەی گۆرانی هەندێك تیشكی ڕێبازی ڕۆمانسی دەبینرێت كە دواتر لە پۆلەكانی تر دەیخوێنین و باسی دەكەین ، هەروەها شعری سەر بە تەریقەتی (ئەهلی حەق) بەم زاراوەیە نوسراوەتەو ، یا شاعیرێكی گەورەی وەك (خانای قوبادی) داستانی (شیرین و خوسرەو) ی پیێ نووسیوەتەوە كە شاكارێكی مەزن و ناوازەی ئەدەبی كوردییە.

یەكێكی تر لەو شاعیرانەی كە بە شێوەی (گۆران) هۆنراوەیان هەیەو بە پێشەنگ دادەنرێن و هۆنراوكانیشی بەر قوتابخانەی كلاسیزم دەكەون لە ئەدەبیاتی كوردی دا (بێسارانی) یە.

## ڕوخسار و ناوەڕۆكی هۆنراوەكانی:

ئەگەر سەرنجێك لە هۆنراوەكانی بێسارانی بدەین بۆمان دەردەكەوێت كەلە گەلێك لایەنی ڕوخسارەوە، هۆنراوەكانی دەكەونە بەرقوتابخانە و ڕێبازی كلاسیزم ، هۆنراوەكانی بە كێشی عەرووزی عەرەبی داناوە، بەشی زۆری هۆنراوەكانی لەسەرقافیەی دێری (مەسنەوی) یا جووت سەروا داناوە، واتە هەردوو نیوە دێرلە هۆنراوەكەدا یەك سەروا (قافیە) یان هەیە، جگە لەمە بێسارانی پەنای بردووەتە بەر بەكارهێنانی وشە و پەیڤی بیانی لە هۆنراوەكانیدا بەتایبەتی وشەی عەرەبی وفارسی، دیارەئەمەش بەهۆی ئەو تێكەڵاوییەی كە لەگەڵ ئەو دوو زمانەدا هەبووە، هاتووەتە ئەنجام، بەوپێیەیكەخۆی پیاوێكی ئایینی بووە و خوێندنەكەشی هەر لەم لایەنەوە بووە. سەرەڕای ئەمانەش لە هۆنراوەكانیدا هەمووجۆرە وشەكاری ولایەنەكی ڕەوانبێژی بەكارهێناوە.

لەرووی ناوەڕۆكیشەوە هۆنراوەكانی بێسارانی بەزۆری بەدەوری سیێ مەبەست دا دەسوڕێنەوەكەدەتوانین بەم جۆرە دەست نیشانیان بكەین.

## ١- ئەڤینی ودڵداری:

بەشی هەرەزۆری هۆنراوەکانی بێسارانی بەدەوری ئـەم مەبەستـەدا دێـن و دەچن، دیارە، زۆربـەی شـاعیرانی کلاسـیزم گرنگییـەکی زۆریـان بـەم جـۆرە هۆنراوانە داوەویەکێك بـووە لـەو شـا مەبەسـتانەی کـە لـە هۆنراوەکانیـان دا پەیڕەویان کردووە. سۆزی ئەڤینی وخۆشەویـستی لای بێـسارانی پاڵـدەرێکی زۆر بەهێز بووە و یەکێك بـووە لەوهۆکارانـەی کـە وەرچـەرخانێکیان لـەژیانی بێـسارانیدا کـردووە و بـەلای شـیعرو هۆنراوەیـان دا بـردووە. نموونـەی ئـەم جۆرەهۆنراوەش، ئەو پارچە هۆنراوەیەیە کە لـەم شـوێنەدا هێناومانەتـەوە و بـۆ لەبەرکردنیـشە وکەبـە (چـراغ وەنەوشە،چنوورچـەنی گـوڵ) دەسـت پێ‌دەکات.

## ٢- خواناسی ودەروێشی (تەسەووف):

ئەم مەبەستەش بە ئاشکرایی لـە هۆنراوەکـانی دا ڕەنـگ دەداتـەوەو لـە مەوە هاتووە، کە بێسارانی پیـاوێکی ئـایینی و مـەلاییێکی خوانـاس و ڕاسـتی ناس بووە وەکو لەم نموونەیە دا دەڵێ:

**١- ئێمەیچ پەروانەی شەم شناسانیم — پەڕو باڵ سوفتەی دینی خاسانیم**
**٢- میللەتی پاك دین، پێغەمبەرانیم — نەك جەتایفەی کـەم نەزەرانیم**
**٣- بنمانـە جەبێن نوری پاکتـەن — ئەرتۆ پاکەنی جەکێ باکتـەن**

(هەمووی بۆ لەبەرکردنە)

## لێکدانەوەی پەیڤان:

ئێمەیچ : ئێمەش ، ئەم ژی

پەروانە : پەپوولە ، پەلاتینك

شەم : مۆم . شەمع

شناسانیم : دەناسن ، ناس دکەن

سوفتە : سوتاو ، کون کون ، سوهتی

دینی خاسان : ئایینی پیاوچاکان ، ئایینی خۆش مرۆڤان

ئێمەش ئەو پەلاتینك و پەپوولانەین کە مۆم دەناسن و بەدەوریدا دەسوڕێنەوە، چونکە شەیدای ئەو ڕۆناکییەن، پەڕو باڵ سووتاوی ئایینی پیاوچاکانین.

٢- جەتایفەی : لەتایفەی

ئێمە پەیڕەوی کەرانی ئایینی چاکی ئەو پێغەمبەرانەین کە پێشەوای ڕاستی ئادەمیزادن نەك ئەو کەسانەی کە لێ ورد بوونەوەیان نییە و کەس نەزەرن.

٣- بنمانە : دەرەخە، پیشان بدە، نیشا بدە

جەبین : نێوچاوان، ئەنی هەنیە

ئەر : چونکە

پاکەنی : پاکی خاوێن، پاقژی ، پاکژی

جەکێ باکەت : باکت لە کێ هەیە، باکت بە کێیە، منەتت بە کێیە.

دەرخە ناوچەوانی خۆت، ئەو ناوچەوانە نوورانیە پاکەت، چونکە کە تۆ پاکیو خاوێنی ئیتر باکت یان منەتت بەکێیە؟

### ٣- کۆمەڵایەتی :

ئەمەشیان یەکێکە لەو مەبەستانەی کەلە هۆنراوەکانی بێسارانی بەرچاو دەکەوێت ، بۆ نموونە دەڵێ:

**١- ئارۆ وێنەی وێم دیم خەزانێ زار**

**بەندبێ بەزامەت جەور و جەفای خار**

**٢- ئەو جە دەردێ وێش بێ مەدارا بێ**

**خار چەنگێ زامەت لێش و یارا بێ**

(هەمووی بۆ لەبەرکردنە)

ئارۆ : ئەمڕۆ ، ئەڤرۆ

وێنەی وێم : وێنەی خۆم ، وەکو خۆم

دیم : بینیم ، دیتم ، من دیت

خەزانێ زار : گەڵای زەردی پاییز

زامەت : بەزەحمەت

خار : دڕك ، ستری ، ئەستری

ئەمڕۆ گەڵایێکی زەردی وەکو خۆم دیت ، کە ئەویش وەکو من گرفتاری جەورو جەفای هەڤاڵەکەی خۆی ببوو.

وێش : خۆی

جەدەردێ وێش: لە دەردی خۆم

بێ مەدارا : بێ تاقەت

چەنگێ : چنگ ، مشك ، لەپ ، دەست

لێشیو یارابێ: لێی هەڵپێکابوو ، تێی ئاڵابوو

ئەو گەلایە بە دەستی ئازاری خۆیەوە تاقـەتی لێ بڕابـوو، سـەرەڕای ئەمـەش دڕكێكی پێداچوو بوو كە چنگی تێئالاندبوو، جوولەی لەبەر بـڕی بـوو . جگـە لەم مەبەستانە بێسارانی مامۆستای وەسف كردن بـووە، بەتایبـەتی وەسـفی سروشت، بە دیمەنە جـوانو چـیا بلّنـدەكانی، ئـەم دیاردەیـەش لـە هـۆنراوە ئەڤینی و دلّداریەكانیدا ڕەنگ دەداتـەوە، كـە ئەمـەی خـوارەوە نموونەیەكـە لەوان:

**١- چراغ وەنەوشە چنور چەنی گـــولّ**

**عەزم رای ویـسالّ تۆشان هانـــە دلّ**

**٢- چنوور جەسەر كۆ وەنەوشە جەچەم**

**گولّ جەگولّستان وەهەم بیەن جـــەم**

**٣- واتشان بەمن بەندەی فلانی**

**چون حالّ زانەنی بەحالّ بەحالّ مەزانی**

**٤- بونە رای ئەلّلا بكەرە كاریّ**

**بیـــاومیّ بەوەسلّ ئەودلبـــەر جـاریّ**

**٥- چراغ, یە هەرسێم بەستن بە دەستە**

**چ دەستە، دەستـــــەی زگاران بەستـە**

**٦- هەرسێم یەئاورد چون خاكە ساران**

**هەریەك وایەی وێم وەچەی مـــەداران**

**٧- چنوور پەی زولفت پەشێە حالّشەن**

**وەنەوشە سەودای خەیالّ خالّشـــــەن**

**٨- گولْ پەی جەمینت مەسۆچۆ چون شەم**

**جە دووریت نیشتەن نە پاش خاریٚ خەم**

**٩- ساحیب مایەنی بلْند بۆپایەت**

**با وایــە گێـران هەریڕ جە مایــەت**

(لەسەرەتاوە پێنج دێری بۆلەبەر کردنە)

## لێکدانەوەی پەیڤان:

١- چراغ : مەبەستی خۆشەویستەکەیەتی، چرا

وەنەوشە : گولێکی جوانە لەناو چەمو باخاندا داشین دەبێت

چنوور : گولێکی چیاییە

عەزم : ئیرادە ، قەسد ، نیەت

ڕای ویسال: ڕێی پێك گەیشتن

تۆشان : هەتۆ

هانە دلْ : وا لەدلْ

خۆشەویستەکەم ، وەنەوشەو چنوورو لەگەلْ گولْ ، قەسدی ڕێی گەیشتن بەتۆیان لەدڵە، واتە نیازیانە بێنە دیدەنت.

٢- جەسەرکۆ: لەسەرکێو ، لەچیا

جەچەم: لەچەمو باخان

وەهەم : پێکەوە

بیەن جەم: کۆبوونەوە، کۆم بوون

چنوور لەشاخو کێوانو وەنەوشەش لەناو باخانوگولێش لەگولستان دا پێکەوە کۆبوونەتەوە.

٣- واتشان بەمن: گۆتنەمن ، بەمن گۆت.

چون حال زانەنی: چونکە تۆ حاڵزانی، یان حاڵ دەزانی

بەحاڵ مەزانی: بەحاڵی ئێمە دەزانی

بەمنیان گوت ئەی بەندەی فلانی، چونکە تۆ حاڵزانی، بۆیێ بەحاڵی ئێمە دەزانی، واتە ئاگات لەحاڵ و باری ئێمەهەیە.

٤- بونە ڕای ئەڵلاّ: لەڕێی خوادا

بکەرە کارێ: کارێکی وابکە

بیاومێ: بگەین ، بگەهین

بۆ خاتری خوا کارێکی وابکە ،بگەین بەخۆشەویستەکەمان تەنانەت بۆجارێکیش بێت.

٥- یەهەرسێم: واتە هەرسێکیانم (وەنەوشەکەو چنوورەکەو گوڵەکەم) خۆشەویستەکەم ، واهەرسێکیام بەدەستە بەستن‌و کردنم بەدەسك بەلاّم چۆن دەسکێك ، دەستەیەك کەزویرو خەفەتبارن.

زگاران: زویرو خەفەتبار.

٦- یەئاورد: واهێنامن،

چوون: وەکو

خاکەسەران: کەسانێك کەدەکەونە ژێر پێی یەکێکی ترەوە، تامەرتەبەی بچووکایەتی خۆیان نیشان بدەن ، داماوان

وایە: مەرام: ئامانج

وێم : پێمە ، وایەی وێم = مەرامی پێمە ،نیازی پێمە

وەچەم مەداران: چاوەڕوانی دەکەن ، چاڤەڕێنە. چەم :چاو :چاڤـــ
هەرسـێکانم هێناوەتـە بـەردەمت بـەداماوی، هەریەکـە مـەرام و مەقـسودێکی
پێتەو چاوەڕوانی دەکەن .

٧- پەی: بۆ پەی زولفت: بۆزوڵفت
پەشێو حاڵشەن: حاڵی پەشێوە، حاڵی تێکچووە.
سەودای خەیاڵ خاڵشەن: عەوداڵی خەیاڵی خاڵی تۆن.

چنوور حاڵی پەشێوو نالەبارە بۆزولفت ، وەنەوشەش سەودای
خەیاڵی خاڵی ڕووی تۆی کەوتۆتە سەر.

٨- پەی جەمینت : بۆڕووت
مەسۆچۆ: دەسووتێ ، دسۆژێن
چون شەم: وەك مۆم (شەمع).
جەدووریت: لەدووریت ،ل دووریاتە
نە: لە
نەپلش: پلش: پەنجە، ئەنگوست ، لێرەدا مەبەستی پارچە (پڵە) گۆشتی دڵە.
خاریێ: دڕکێك ، خار = دڕك، ستری

گوڵ بۆڕووت دەسووتێ هەروەك مۆم (شەمع) ، لەبەردووریت دڕکی
خەمی نیشتۆتە ناو دڵو دەروونی.

٩- ساحیب مایەنی: خودانو خاوەنی سەرمایەی
بڵند بۆپایەت: بڵندە پایەو مەقامت
باوایە گێڕان: بامەقسەد بگرن
هەریر: هەر یەك، هەرئێك

جەمایەت:                    لەسەر مایەت

تۆخودانو خاوەنی سەرمایەو سامانی ، کەجوانییەکەتە، بۆییّ پایەو مەقامت بەرزو بلّندە. باخەلّکان چاوبڕنە، یان مەقسەد بگرن هەریەکەیان لەو سەرمایەی کەتۆهەتە واتە لەجوانییەکەت.

# ئەدەبییاتی کلاسیزمی کوردی – شێوەی کرمانجی ژووروو

لەمەو پێش ئەوەمان زانیوە کەهەر ناوچەیەك لە کوردستان، ئەگەر لەباری ژیانو مێژووی کۆمەلآیەتیو ئابووریو سیاسی پێشکەوتنی بەخۆیەوە بینی بێت، ئەوا ئەدەبییاتی کوردی لەویَ سەری هەڵداوەو بە دیالێکتی ئەو ناوچەیە ئەدەبییاتەکە نووسراوە.

ئینجا ئەدەبییاتی کلاسیزمی کوردی بە دیالێکتی کرمانجی ژوورووئەوەی کە مابێتەوە نەفەوتابێت مێژووەکەی بۆ سەردەمی میرنشینی بۆتان دەگەڕێتەوە، شاری جزیرە کە پایتەختی میرنشینی بۆتان بووەو جەرگەی پەیدابوون و پەرەسەندنی ئەدەبییاتی کوردی بە زاراوەی کرمانجی ژووروو بووەو هەر بەشە دیالێکتی ئەو ناوچەیە بووە بە بناغەی ئەو زمانە ئەدەبییەی کرمانجی ژووروو، کەلەو کاتەوە کوردی پیَ دەنووسرێتو زۆر شاعیر هەبوون کە خەڵکی ئەو ناوچەیە نەبوونو سەر بەو بەشە دیالێکتە نەبوون، یا تەنانەت سەر بە کرمانجی ژوورووش نەبوون، بەلآم دەسەلآتو تەشەنە سەندنی ئەدەبییاتی کوردی بە زاراوەی بۆتانی وای لیَ کردبوون کەبە دیالێکتی بۆتان هۆنراوە بنووسن.

شارەزایانی مێژووی ئەدەبییاتی کوردی وایان بۆ دەرکەوتووە، کە ئەدەبییاتی کلاسیزمی کوردی بەدیالێکتی کرمانجی ژووروو لە نیوەی دووەمی سەدەی شانزەهەم و سەرەتای سەدەی حەڤدەهەم سەری هەڵداوە، ئەو شاعیرانەی کە بەم دیالێکتە هۆنراوەیان نووسیوە زۆر ئاشکران (فەقێی تەیران، مەلای جزیری، عەلایی حەریری، ئەحمەدی خانی، مەلاییَ باتەیی، شاپرتەوی هەکاری، مەلامەنسوری گرگاشی، شێخ محەمەدی مەغریبی)

ئەمجا لێرەدا تەنها باسی مەلای جزیریو ئەحمەدی خانی دەکەین بۆ خوێندنی ئەدەبییاتی کلاسیزمی کوردی بە دیالێکتی کرمانجی ژووروو.

# مەلای جزیری

## ژیانی :-

مــەلای جزیــری بەمــەلا ئەحمــەد یــا شــێخ ئەحمــەد بەناوبانگــە لەبەرئــەوەی لەشــاری جزیــرەی پایتــەختی بۆتــان ژیــاوە، بــەجزیری نــاوی دەرکردووە، ئەم شاعیرە مەزنە لەساڵی (٩٧٥) کۆچی کە بەرامبەر ساڵی (١٥٦٧–١٥٦٨)ز هاتۆتە دونیاوە، مەلای جزیری وەك هەموو مەلا گەورەکانی کوردستان ڕۆژانی فەقێیەتی وخوێندنی لەگەڵێك ناوچەی کوردستان دا بردۆتەسەر، پاشان لەچەند شوێنێك مەلایەتی کردووە و دوایی لە مزگەوتی سوور جێگیر بووە، کە لە ڕۆژانی دەسەڵاتی میرانی بۆتاندا شوێنی خوێندن و پێگەیشتن بووەو سەدان فەقێی تێدا بووە کەمیر خۆی مەسرەفی بۆکردوون.

مەلای جزیری لەساڵی (١٠٥٠) کۆچی کە بەرامبەر (١٦٤٠)ز کۆچی دوایی کردووە، لەمزگەوتی سوور نێژراوە.

مــەلای جزیــری نازنــاوی هــۆنراوەی (مــەلا، یــان مــەلێ) بــووە، هەنــدێك جــار (نیــشان)یشی بۆخــۆی کــردووە بــەناو، چــونکە دڵــی خــۆی بەنیــشانی تــیری خۆشەویستی و ئازار داناوە، یاهەرنیشان خاڵی گۆنایەلەبەرئەوەی زۆر باسی خەت و خاڵی کردووە، خۆی ناوناوە(نیشانی).

مــەلای جزیــری بەدامەزرێنــەری ئــەدەبیاتی کلاســیزمی کــوردی بــەزاراوەی کرمــانجی ژوورو دادەنرێت،چــونکە لەســەردەمی خۆیــدا بەرهــەمێکی ئــەدەبی پتــەووتازەی هێنایــە کایــەوە کەلەمــەو پــێش نــەبووە، واتــە تازەگــەر بــووە، ئەمەش ڕەنگ دانەوەیگەشەسەندنی شاری جزیرەو ئــاواتی پــەل هاویشتنی میرانی بۆتان بووە، دەتوانرێت ڕاستی ئــەم لێکدانەوەیــە بــە دێرێکــی مــەلای

جزیـری خـۆی بـسەلمێنرێت، کـە لـە وێـدا ئـاواتی ئـەویش لـەوە دایـە کـە هۆنراوەکانی لە سنووری جزیرە بچنە دەرەوە شاعیر دەڵێت :

**گوڵی باخی ئیرەمی بۆتانم**

**شەب چراغی شەبی کوردستانم**

واتە : (گوڵی باغی ئیرەمی بۆتانم و شەوچرای شەوی کوردستانم )

**بەرهەمی :**

مەلای جزیری دیوانێکی گەورەی هـۆنراوەی کـوردی هەیـە، ئـەم دیوانـە چەند جار و لە چەند شوێن دا (لە بەرلین و ئەستەمبوول و هەولێرو قامیـشلی و بەغداو تەهران) چاپکراوە، دیوانەکە هەمووی لە چاپەکەی قامیـشلی دا بـە عەرەبی لێکدراوەتەوە.

ڕۆژهەلاتناس و کورد ناسی بەناوبانگ ڤلادیمیر مینۆرسکی دەلێـت:– (ئەگـەر ڕۆژ هەلاتناسـی ئـەورووپا کەسـێکی چـنگ نەکـەوێت دیـوانی مـەلای جزیـری بگۆڕێتە سەر زمانەکانی ئەورووپی، ئەوا بەڕاستی لە نرخی ئەدەبیاتی کوردی و بەرزی زمانی کوردی ناگات ) بەڵێ مەلای جزیری بەڕابەری ئەدەبی کـوردی دەژمێردرێت. چونکە لە سەردەمی خۆی دا شتێکی هێناوە ناوەوە کـە تـەواو تازە بوو

تا سەردەمی ئەو هەموو خوێنـدەواری کـورد خـەریکی خوێندنـەوەو چـێژ لـە ئەدەبیاتی ڕۆژهەلات وەرگرتن بوون ، بەلام ئەو هات و سەر لە نویّ بـە بـۆن و خۆشیی مۆسیقای هۆنراوەی ڕۆژهەلات ، بـە تایبـەتی هـۆنراوەی باووبـاڵای سەردەمەکەی پێش خـۆی و سـەردەمی خۆشـی ، چـەش بـوونی دارشـتەوەو خـستیە قـالبی هـۆنراوەی کـوردی یـەوە زۆرجـار ئەدەبیاتناسـان باسـی

پەیوەندی نێوان مەلای جزیری و حافزی شیرازی دەکەن و دەڵێن : حافز زۆر کاری کردۆتە سەر مەلای جزیری.یا مەلای جزیری زۆر شتی لە حافز وەرگرتووە٠ بەڵام ئەو کارتێکردنە هەرچەندێك بێت ، بەشی تازەگەری و ڕابەری بۆ مەلا دەمێنێتەوە ، چونکە ئەوەی حافز فارسی بووە ، ئەوەی ئەم کوردی بووە ، مەلا پێش هەموو کەس بە کوردی پەیڕەوی ئەدەبیاتی خۆرهەلاتی ئیسلامی کردوو هونەری ئەم جۆرە هۆنراوانەی بە کوردی داڕشت ئەمە بۆ ئێستا کۆنە بەڵام بۆ ئەوکاتە زۆر تازە بوو.

## ڕوخساری هۆنراوەکانی :

ئەمڕۆ بەهۆنراوەی مەلای جزیری دەڵێین کلاسیزمی کۆن٠ تەنانەت هۆنراوەیمەلای جزیری تەنها لەبابەتی کلاسیزمی کوردی نییە،بەڵکوبابەتی کلاسیزمی ڕۆژ هەڵاتە٠

١- زمانێکی کوردی تێکەڵ بەوشەی فارسی و عەرەبی و تەنانەت تورکیشی بەکارهێناوە.

٢- بەکارهێنانی ئەو (کێش)انەی هۆنراوەی عەرەبی کەلەفارسی دا هەبوون٠

٣- پاراستنی پەیڕەوی هۆنراوەی کلاسیزمی لەقافییەدا، واتە یەکێتی قافییەو دواپیت (ڕەویە).

٤- پاراستنی بابەتی غەزەل و قەسیدە لەهۆنراودا،دەتوانین هۆنراوەی مەلای جزیری بەچەشنێك لەو وشەکارییە دابنێین کەلەهەموو هۆنراوەی کلاسیزمیدا هەبووە، بەڵام دەتوانین ئەوەش بڵێین کەمەلای جزیری زۆر بەهرەوەرانە توانیویەتی سۆزی دڵی خۆی بەجۆرێك بکات بەوشەو بەهۆنراوە کەهیچ زۆر لەخۆ کردنی پێوە دیار نەبێت وسۆزی دڵەکە،وشەکارییەکەدابپۆشێت و هۆنراوەی جوان و پڕ لەگەرمیی ڕاستی وپڕلەسۆزمان پێ ببەخشێت.

## ناوەرۆکی هۆنراوەکانی:

دەتوانین بڵێین دیوانی مەلای جزیری دیوانی دڵدارییە، بەلام کام دڵداری؟ ئەدەبییاتناسان زۆر بە درێژی لەوە دەدوێن کە دڵداری مەلای جزیری وەك هۆنراوەی (حافز) و (جامی) و (ابن الفارز) دڵداری ئاسمانی یا دڵداری سۆفیانە و خواییە.

بەڵێ لە هۆنراوەی کوردی دا ئەم چەشنە هۆنراوەی دڵدارییە دیارە. زۆر جار کە شاعیر لە دڵداری سەر زەمین دا سەرناکەوێت ، ڕێگە دەباتە بەر هیوایەکی دوور، بە نائومێدی و نەبوونێکی بێ کۆتایی، بە ئاواتی لەو دونیا لەگەڵ دڵداردا بە یەکتر گەیشتنەوە ، بەم جۆرە دڵدارییەکەش لەوەو کە حەزلە جوانی لەش و لارو چاو و ئەبرۆ کردن بێت, بەرەو حەز لێ کردنێکی تر دەبرێت ، بەرەو زاڵ بوونی گیان بەسەر لەش دا . بەم جۆرە مەلای جزیری دەستی ناگاتە دڵدارەکەی کە ناوی (سەلمایە خوشکی میری بۆتان بوو) لەبەرئەوە دیوارە جیاوازەی کۆمەڵایەتی کە لە نێوان ئەو و خوشکی میردا دەوەستێت ، ئەوا خۆشەویستییەکەی دەباتە مەیدانی گیانپەرستی و خوا پەرستی و ڕێبازی تەسەوفەوە.

خاسیەتێك لە هۆنراوەی مەلای جزیری دا هەیە ، کە دوای خۆی لای هەندێك شاعیری سۆفی تر دیارە ، ئەویش ئەوەیە کە دەست دەدەیتە خوێندنەوەی هۆنراوەکانی وات بە بیردا دێت کە پەیکەرێکی جوانیی لە بەردەمی شاعیردا بێت شاعیر بە وشە سەرلە نوێ نیگاری ئەو نەخشەیە بکێشێتەوەو هەستی خۆشەویستی خۆی بۆ ئەو دەرببڕێت، بەلام وردەوردە ئەو پەیکەرە دەبێت بە جوانی خوایی و شاعیر لە میحرابی ئەو دا بە سەرسامی دەوەستێت . ئەمەیە ناوەڕۆکی هۆنراوەی مەلای جزیری ، هەر لەبەر ئەمەشە کە دڵسۆزی

و ڕاستگۆییەکی تەواو لە هۆنراوەکانی دا بەدی دەکەین هۆنراوە لای مەلای جزیری بۆ مەبەستێکە کە خۆی بۆ تواندۆتەوە ، هەر لەبەر ئەوەیە کە هۆنراوەکانی لە دەوری یەك باس دەسوڕێنەوە، ئەگەر هەندێك وردەباسی تر لە هۆنراوەکانی بەدی بکرێت ئەوا هەر لە پەراوێزی ئەم باسەدان.
بەدەم ئەو دڵدارییە ڕاستەقینەوە مەلای جزیری هەندێك باسی تریشی کردووە بە کەرستەی هۆنراوەکانی ، وەك ستایشی هەندێك لە میرەکانی جزیرە ، یان بە ئامارژە شاعیرانە باسی هێرشی مەغۆل و تاتار یا هەندێك وەسفی گشتیی سروشتی جوانی کوردستان
نموونەیەك لە هۆنراوەی مەلای جزیری:

**١- ئـــیرۆ ژڕەمـــزا دێـــم دوڕێ**
**میننەت کو من مەـــسرووورە دل**
**دلـــبەر ب فــنجاناســـوڕێ**
**مەی دامــەو مەخـــموورەدل**
**٢- ڕەمزەك نـهێن ئاڤـێهتــە دل**
**میـهری ژبــاتــێن مێهتە دل**
**شەهـزادەیــێ سوڕ ڕێهتــە دل**
**شەهکاســەیــا فەرفوورە دل**
**٣- هۆستـایێ عیشقێ دل هەڤووت**
**سەرتـا قەدەم هێنگێ د سووت**
**ڕەمزا (ئەنەلحەق) هەردگووت**
**بـاوەڕ بــکەن مەنســوورە دل**

٤- دل لێ بدەت نوورا مەیێ
وەختی سواش و هەی هەیێ
فەهم ئەربکەت وەحیا نەیێ
ژێ دەت خەبەر مەئمووره دل
٥- نوورا ژقودرەت لێ دوونوون
ژێڕا دنالن ئەرغە نوون
ومر ئایەتا عیشقێ بخوون
خوەش نوسخەیەك مەستووره دل
٦- تەفسیری سیرا ئایەتێ
عارف دڤێتن گوە دەتێ
ڕازا ڕەموزێن قودرەتێ
گەر دەین بکەت مەعزووره دل

(لەسەرەتاوە چوار کۆپلەی بۆلەبەر کردن)

**لێکدانەوە:**

١- (ئێرۆ) : ئەمڕۆ، ئەڤرۆ.

دێم : ڕوو دم وچاو

دوڕێ : وەك دوڕ

(سوڕ)یا(سڕ): نهێنی دل، دل ڕاکێشان، جەزبی دل

مەی : بادە، شەراب

دامە : دای بەئێمە

مەخموور: سەرخۆش

واتە منەت بۆخودا کەمن ئەمرۆ دڵم بەهۆی ئەو خۆشەویستەوە خۆشە، کەرووی وەك دورِوایە، ئەوەی دڵی بردینو جامیمەی دڵ ڕاکێشانی خۆیی داینێ و دڵ بەوە سەرخۆشە.

٢- نهێن: نهێنی، شاراوە ، ڤەشارت

ئاڤێهتە: ئاوێتە, هاوێشتە

میهر: خۆشەویستی یاتیشکی ڕۆژ

مێهتە: لە(مێهتن)ەوە هاتووە بەمانای مژین، واتە مژیی

ڕێهتە: لە(ڕێهتن)ەوە هاتووە بەمانای ڕشتن، یاڕژاندن، واتە ڕژاندی

شەهکاسا : واتە کاسەی شاهانە.

فەرفوور : وشەی فەغفوور لەکوردیدا کراوە بەفەرفوور ، فەغفوور پاشای چین بووە، فەغفووری یافەرفووری ئەو کاسەیە کەدەدرێتە پاڵ ئەو.

واتە: خۆشەویستەکەم ئیشارەتێکی نهێنی هاوێشتە دڵەوەو خۆشەویستی بەباتینی یابەشاراوەیی دڵی منی مژی، شازادە جەزبی خۆیی ڕشتە دڵەوە دڵ وەك فەغفووری وایە.

٣- (هۆستا): وەستا، مامۆستا

هەڤووت: سووتاو

هێنکێ: کاتێك

دسووت: دەسووتا.

واتە: وەستای دڵ سووتاوی عەشق کاتێك کەلەسەر تابەپێی بەئاگری عەشق دەسووتا، ئەو ڕەمزی(ئەنەلحەق)ی دەگوت، باوەڕبکە کەدلی من مەنسوورە. لێرەدا مەنسوور بەمانای سەرکەوتوو دێتو هەموودێڕەکەش ئیشارەتە

بۆسەر گوزەشتەی مەنسووری هەلاج (٨٥٨-٩٢٢)ز کەتامرد، هەرهاواری دەکرد (ئەنەلحەق) واتە: شاعیر دەڵێت منیش لەعەشقی خوادا وەك مەنسوور تامردن و سووتاندن هەرهاواری (ئەنەلحەق) مە.

ئەمەش لەسۆفێیتیدا پلەی فەنابوونی پێ دەڵێن.

٤- لێ: لەو

سواش: شەڕ ،جەنگ

هەیهەی: هاوارو دەنگە دەنگ

ئەر : ئەگەر

وەحیانەیێ : وەحیی نای

ژێ : لەو

دەت خەبەر : خەبەر دەت ، قسەبکات

واتە: ئەگەرنوورو ڕووناکیی مەی لەکاتی جەنگو هەرای عاشقاندا بدات لەدڵو ڕووناکی بکاتەوەو ئەگەر دڵ لەوەحی نای گەیشتو زانی کەدەنگی نای دەنگی عەشقی خواییەو بەو تێگەیشتنە کەوتە قسە کردنو ڕلستی گوتنو نهێنی دەربڕین. ئەوە پلەیەکە دڵ گەیشتۆتیێو فەرمانی پێکراوە کەنهێنی نەشارێتەوەو ڕاستی بڵێت .

٥- نوورا ژقودرەت : ڕووناکییەك لەقوودرەتەوە، لەخواوە، مەبەست ناوچەوانە.

لێ: کورت کراوەی لە ئەوێ، واتە لەو.

دوونوون: دوو چاو، دوو ئەبرۆ

ژێرا: بۆ ئەو

ئەرغەنوون : ئالـەتێکی مۆسـیقایە، کـە لێـرەدا جێگـەی دڵـی عاشـقان دەگرێتەوە.

وەر : وەرە

نوسخە : کتێب

مەستوور : نووسراو ، مسطور

واتە: دڵی عاشقان کە وەك ئەرغەنوون وایە هەمیشە هـەر هـاوار دەکاتو لـە خۆشەویـستی ئـەو ناوچـەوانە ڕوونـاکی بەخـشە دەناڵێنێـت کـە دوو ئەبرۆو(چاو)ی پێوەیەکە لە دوو پیتی هەڵگەڕاوەی (نـوون) دەچێت ئەمـەش هـەروەك قورئـان دەسـتکردی خوایـە، دەوەرە ئایـەتی عەشـق لـەو دەم و چاوەدا بخوێنەوە، کە نوسخەیەکی نووسراوەی چاكو خۆشی کتێبی خوایە.

٦- دڤێتن : دەوێتن

گوهـ دەتیٚ : گوێی بداتیٚ

ڕاز : نهێنی دڵ

ڕمووزێن قودرەتی: ڕەمزەکانی قودرەت ، ئیشارەتی خوایی

گەر : ئەگەر

دەین بکەت : قسە بکات

واتە : عارف کە نهێنی خوایی دەنوێنێت، دەیەوێت گوێ بدەیتە لێکدانـەوەی نهێنی ئەو ئایەتی جوانییەی باس کرا، یا خۆی گوێی دەداتیٚو ئەگـەر نهێنـی ڕەمـزو ئیـشارەتی قـودرەت واتـە خوادەربخـات بیـانوو و عـوزری هەیـە یـا دەتوانین بڵێین (دیـن بکـات) واتـە شـێت بکـات. بـە مانـا ئەگـەر ئـەو نهێنـی جوانیو عەشقە پیاو شێت بکات هەقەو بیانوو بۆ ئەو شێت بوونە هەیە.

# ئەحمەدی خانی

ئەحمـەدی خـانی بـەناوبانگترین شـاعیری کـۆنی کـوردە، لووتکـەی شـیعری کرمانجی ژووروو و دوا شاعیری گەورەیـەتی ، ناوبـانگی ئەحمـەدی خـانی لـە گەڵ مەم و زیندا سنووری دووری وڵاتی بڕیوە و بە جیهاندا بلاو بۆتەوە.

## ژیانی خانی:

خانی تاکە شاعیری کۆنمانە کە خۆی مێژووی لە دایك بوونی خـۆی بـۆ تۆمار کردووین کە دەڵێت :

**لەوڕاکو دەما ژغەیب فەك بـــوو**
**تەئریخ هەزار و شەست و یەك بوو**

**واتە:**

لە بەر ئەوەی کاتێك لە نەبوون پەیدا بوو، ساڵ ساڵی هەزارو شەسـت و یـەك بوو، واتە لە سـالی (١٠٦١) ی کۆچی هاتۆتـە دونیـاوە کـە دەکاتـە (١٦٥٠) ز بەڵام لە کوێ؟ هەندێك هەر لەبەر ئـەوەی لـە بایەزیـد کۆچـی دوایـی کـردووە لەوێ نێژراوە دەیکەن بە خەڵکی بایەزید. بەڵام ئەگـەر بـە وردی مـەم و زیـن بخوێنینەوە لەوە دەگەین کە خـانی زۆر بـە تونـدی بەسـتراوە بـە جزیـرەوە, هەرچەندە ڕوودانی چیرۆکی مەم و زین لە ناوچەی جزیرەدا هۆیەکی گەورەی ئەمەیە ، بەلام ئەوەش دیارە کە خانی لە جزیرەدا زۆر ژیـاوە ، هـەر وەك لـە مەم و زینەوە بۆمان دەردەکەوێت کە خانی زانایەکی گـەورە بـووە شـارەزای فەلسەفەو گەلێك زانستی تر بووە. هەر ئەمە ڕاستی ئەوەمان بۆ دەردەخـات کە لە زۆر کتێب دا دەربـارەی ژیـانی خـانی نووسـراوە ، کـەوا لـە زۆر شـوێن خوێندوویـەتی بـووە بـە مەلایـەکی گـەورە لـە جـەزیرەو بایەزیـد دا دەرسـی گوتۆتەوەو گەلێك مەلاو زانای تـری پێگەیانـدووە خـانی لـە سـالی (١٧٠٦) ز کۆچی دوایی کردووە.

## بەرهەمی:

لەوبەرهەمانــەی خــانی کەئێــستا مــاون ولەبــەر دەســت دان دەتــوانین چوارجۆردەست نیشان بکەین:

١- غەزەل و قەسیدە

٢- عەقیدا ئیمان

٣- نەوبارا بچووکان

٤- مەم و زین

## ١- غەزەل وقەسیدە:

خانی هەر بەمەم وزین ناوبانگی دەرکردووە،بەلاّم لەم دواییەدا هەنـدێك هۆنراوەی دۆزرایـەوە کەئـەوانیش بەشـێکی ترلەهونەرمەنـدیی خـانی پیشان دەدەن ولەڕووی بیرو فەلسەفەی خانییەوە تەواوکەری مـەم وزیـن. بۆنموونـە لە هۆنراوەیەك دا دەڵێت:

**١- میری مەجلیس نەکەت موتریب گۆیــاچ بکــەت**
**غونچەی خەندان نەبتن بولبولی شەیدا چ بکەت**
**٢- بنکا حوسنی بتــان لازمەساحێب نـــــەزەرەك**
**کەسی بینا کونەبت دولبەری زێیا چ بکـــــەت**
**٣- تالیبــی عیلم وکەمال نەبتن قابیلــی فــەیز**
**حیکمەت و تەربیــەتا عالیمی دانا چ بکــەت**
**٤- تەبعی خانی سەدەفا گەوهەرە عیرفانە وەلــیٚ**
**مەتن خــوانەك نەبتن ساحێبی مەعنا چ بکەت**

(لەسەرەتا دوودێری بۆلەبەر کردنە)

### ٢- عەقیدا ئیمان:

کتێبێکی بچووکی عەقایدی ئیسلامە، یا چەند دەرسێکی زانستی (کەلام)ە ، خانی بە هۆنراوەیی پێشکەشی فەقێی کوردی کردووە. لێرەدا خانی وەك مامۆستایەك خۆی دەنوێنێت و نەچۆتە کۆڕی موناقەشەو لێکدانەوەی مەزهەبەکانی ئیسلامەوە، لێرەدا خانی وەك (مەمو زین)ی نەکردووە، بەڵکو کتێبێکی خوێندنی پێشکەش بە قوتابیەکانی کردووە.

### ٣- نۆبارا بچووکان:

لێرەشدا خانیی مامۆستا هاتووە بە هۆنراوەی کوردی فەرهەنگێکی عەرەبی- کوردیی پێشکەش بە منداڵانی کورد کردووە، بۆئەوەی فێری عەرەبی ببن . خانی لێرەشدا وەك کوڕی گەل خۆی دەنوێنێت، ئەم نۆبەرەیەی پێشکەش بە میرو خاوەن دەسەڵات ناکات . بەڵکو بۆ منداڵانی کوردی نووسیوە وەك خۆی دەڵێت :

**نەژبۆ ساحیب ڕەواجان**
**بەلکی ژبۆ بچووکێد کرمانجان**

(بۆ لەبەرکردنە)

### ٤- مەم و زین:

دەمێك بوو ئەنجامی پڕ لە ئازارو مەرگی ناکامانەی مەموزین بوو بوو بەچیرۆك و پشتاو پشت دەگوترایەوە. دەمێك بوو ئەو ئەنجام و ئەو سۆزو فیداکارییەی، سروودی دڵداران بوو. بەڵام خانی هات سەرلەنوێ زیندوویان بکاتەوەو نەمریان پێ ببەخشێت و بەناو ئەوانەوە کۆمەڵێك بیرو ڕاو فەلسەفەی خۆشی دەربڕێت وەك دەڵێت :

**شەرحاغەمێ دل بکەم فەسانە**

**زین و مەمێ بکـــەم بەهانـە**

(بۆلەبەر کردنە)

واتە: (شەرحی غەمی دڵ بـلاّو بکەمـەوەو مـەمو زیـن بکـەم بـەبیانوو) خـانی پشت بەو داستانی (مەمو زین) یا (مـەمی ئـالان)ەی لـەناو خـەڵکی بۆتـان دا بلاّوبووە، هاتووە شتێکی تازەی لەبەرگێکی تازە نووسیوە وەك دەلێت :

**سافی شمراند ڤەخوارد دووردی**

**مانەندی دەری لیسانـی کوردی**

**ئینـانە نیزام و ئیـنـتیزامـی**

**کێشایە جەفا ژبۆ وی عامـی**

(بۆلەبەرکردنە)

واتە: ( بەسـەر شـەرابی پوختـەدا ڕابـوردمو (دوردم) خواردمـەوە کـە تلّپـەی شەرابە، وەك ئەوەی کەبەسەر زمانی(دەریدا ڕابوردم کە فارسی کۆنەو زمانی کوردیم هێناو خستمە سەر نیزامو ڕێك و پێکییـەك و جـەفام لـە ڕێگـەی ئـەو خەڵکە سادەیە کێشا).

بەلاّم وەنەبێت مەم و زینی خانی وەك (مەم زین)ەکەی فۆلکلۆری نـاو خـەڵك تـەنها چیرۆکی دلّداریی مەم و زین بێت، بەڵکو خانی شاعیرانە چـەند شـتێکی لێکداوەتەوەو شتێکی تازەی داڕشتووە.

**هەندێك ژ فەسانەیێد بوهتان**

**هەندەك د بەهانە هەن د بوهتان**

(بۆ لەبەرکردنە)

واتە: هەندێك لەوشتانەی لەناو بۆتاندا باوە کەئەمەش ئەم چیرۆکەیە کەخەڵك دەمـاودەم دەیگێڕنـەوە، هەنـدێك (بەهانـە) واتـە بـیرو ڕای خانییـەو بـەناوی (مـەموزین)ەوە دەری بڕیـوە لەمـەودوا باسـی دەکـەین، هەنـدێك (بوهتـان) یابوختان یابڵێن (درۆیە) مەبەس ئەو ڕووداوو کەسانەیە کەخانی بۆپێویستی چیرۆك دروستی کردوون، یا ئەو وتو وێژەیە کەبـەدەم کەسانی چـیرۆکەکەوە دەی گێڕێتـەوە. خـانی کۆمـەڵێ بـیرو ڕای خـۆی بـەبیانووی مـەم و زینـەوە دەربڕیوە کەئەمانەن:

١- هەرلەسـەرەتاوە، بـەناوی ستایـشی خـواو پێغەمبـەرەوە چـۆتە ناوموناقەشـەی فەلـسەفەوە، گـەلێك لـەبیرو ڕای فەلـسەفەی یۆنـانیو فەلـسەفەی ئیـسلام دەردەبڕێـتو موناقەشـەیان دەکـاتو خۆشـی وەك فەیلەسوفێك وەك موتەسەووفێکی گەورە خۆی دەنوێنێت.

٢- خـانی یەکـەم کـوردە کـەبیری کوردایـەتی لـەقاڵبێکی دیـاری کـراودا دەربڕیوەو هانی کوردی داوە کەیەك بگرنو بەرامبەر بەهێرشـی داگیرکـەرانی ئەو سەردەمە بوەستن.

٣- خـانی لەمـەموزین دا گـەلێك بـیری کۆمەڵایەتیـشی دەربڕیـوەو لەهـەموو ئەمانەدا لەگەڵ هێڵی بەرەو پێش چوونی مێژوودا بووە.

٤- خـانی دڵدارییـە بەسـۆزەکەی مـەم و زینـیش بـەڕێبازێکی تەسـەووفیدا بردووەو (مەم و زین)یشی کردووە بەدوو خوا پەرستی وا کەگەیشتیتە پلـەی فەنابوون.

بەم جۆرە توانیویەتی ئەو مەموزینەی بکات بەگەورەترین بەرهـەمی ئـەدەبی کوردی سەردەمی خۆیو تـا ئێستا لـەڕیزەوی ئـەدەبی کـوردیو ئـەدەبیاتی ڕۆژهەڵاتدا جێگەیەکی بەرزی بۆتەرخان بکات.

## ڕوخساری مەم و زین:

١- مەم وزین بەبەشە دیالێکتی بۆتانی کرمانجیی ژووروو نووسراوە بەڵام هەوڵی ئەوەی داوە کەوشەی زۆر لەبەشە دیالێکتو دیالێکتەکانی تری تێدا ببێت.

٢- خانی لەسەر پەیڕەوی زمانی ئەدەبیی ئەو سەردەم ڕۆیشتووە وگەلێك وشەی فارسیو عەرەبیو تورکی تێکەڵ کردووە.

٣- لەڕووی کێشی هۆنراوەوە خانی کێشی عەرووزی عەرەبی بەکارهێناوە.

٤- خانی لەیەکیەتی قافیە لایداوەو هاتۆتە سەرقافیەی دێری مەسنەوی یاجووت سەروا ،کەپێش ئەو لەداستانە فارسییەکان دابەکارهاتووە. ئەمەش لەکوردیدا شتێکی تازەبووە. یا ڕێکتر ئەوەیە بڵێین لەکرمانجی ژووروودا تازەبووە.

دەنگی خانی تائێستاش هەربەرزو دلێرە. دەنگی سۆزی خۆشەویستییە، باوەڕی نیشتمان پەروەرییە، وردیی فەلسەفەو لەجیهان گەیشتنە، دەنگی کاروانی سەرکەوتوو وبەرەو پێش چووی پێشکەوتنی مرۆڤە، خانی چ لەپتەوی وبەرزی بەرهەمی خۆیدا، چ لەبیری نیشتمان پەروەریدا ئاوێنەی ڕۆژانی گەشەسەندنو هەڵمەت بردنی میر نشینی بۆتانە، ئەگەر تەماشای سەرچاوەکانی مێژووی کوردبکەین، دەبینین لەوسەردەمەی ئەودا خاکی بۆتان واپەرەی سەندبوو کەسەرەتای بەرهەمی پیشەشازی خەریك بوو پەرەی دەسەندو هێزی دەگرتە دەست. هەر لەبەر ئەمەشە کەبیری ڕزگاربوونی نەتەوەیی بەوجۆرە لەشیعری خانیدا دیارە. بەڵام کە داگیرکەری عوسمانی هاتو وڵاتی خاپوور کرد، گەشەسەندنو پیشەسازی و پیشکەوتنی شیعرو هونەریش لە جێی خۆی وەستاو بەڵکو گەڕایەوە دواوە، بەجۆرێك کە

لەناوبچێتو ڕووبکاتە کزیو نەمانو لەو بناغەیەی مەلای جزیریو خانی دایان مەزراند لەدوو سەدەی دوایی دا هیچی نەهاتە سەر. بەلأم چونکە بناغەکە پتەوبوو، لەبەرئەوە بۆ سەرەتایەکی ترو سەرهەڵدانەوەیەکی تر دەستی دەدا، کە ئەویش لە سەدەی بیستەمو قۆناغی ئەو ئەدەبیاتە بوو.

ئەمەش نموونەیەکە لە مەمو زینی خانی:

**١- گەردێ هە بویا مەژی خودانـــەك**
**عـالی کەرەمـەك لەتیـفە دانـەك**

**٢- عیلمو هونەرو کەمالو ئیزعـــان**
**شیعرو غـەزەلو کتێب و دیـوان**

**٣- ئەڤ جنسە ببا ل بال وی مەعموول**
**ئەڤ نەقدە ببا ل نك وی مەقبوول**

**٤- من دێ عەلەما کەلامـێ مـەوزوون**
**عــالی بـکـرا ل بانێ گـــەردوون**

**٥- بینـا ڤــە ڕوحا مەلێ جـزیـری**
**پێ حـەی بکـرا عەلی حـەریـری**

**٦- کەیفەك وەبدا فەقیهێ تەیـران**
**حەتــاب ئەبەد بمایـە حەیـران**

**٧- چ بکەم کو قەوی کەسادە بـــازاڕ**
**نـینـە ژ قــوماشرا خـریـدار**

(لە سەرەتاوە پێنج دێری بۆ لەبەرکردنە)

## ئەدەبییاتی کلاسیزمی کوردی شێوەی کرمانجی خواروو

دوا دیالێکتی کوردی کە بووە بە بناغەی زمانی ئەدەبی ئەو سەردەمەو وەك دیالێکتەکان بەهۆی بارودۆخی سیاسی و کۆمەلأیەتی و ئابووری و جوگرافییەوە ئەدەبییاتی بەرەو کزی یا نەمان نەڕۆیشتووە، دیالێکتی کرمانجی خواروو، کەسەرەتا بەشی (سایمانی)ی ئەو دیالێکتە بووە بە بناغەی قوتابخانەی ئەدبییاتی تازەی کوردی و لەسەردەمی فەرمانڕەوایی بابانەکانەوە وەك زمانی ئەدەبی سەری هەلّهێنا و هێشتا لە گەشەسەندن و فراوان بوون و پەرەسەندندایەو وای لیّ هاتووە کەببێت بەزمانی ئەدەبیاتی سەردەم و زمانی خوێندنی قوتابخانەو کاروباری ڕەسمی لەکوردستانی عێراقداو لەڕووی نەخشەی دیالیکتەکانی زمانەوە هەموو سنووری کرمانجی خواروو، واتە(سلێمانی، سنەو سۆران، موکریان)و هەموو سنووری دیالێکتی(گۆران)ی (هەورامی و زەنگەنە و باجەلان و ڕۆژبەیانی......هتد ) بەشێکی زۆر لەلوڕ بگرێتەوە وەلای هەندێك نووسەری کرمانجی ژووروو، لەهەندێك بەشی ئەو ناوچەیەدا ببێت بەبناغەی زمانێکی ئەدەبی تازەو یەککرتوو بۆ هەموو کورد کەلەسەر بناغەی تێکەڵییەکی ڕاستەقینە و زانستی پەیدابێت و شەقڵی خۆدروست بوونی ژیان و دروست کردنی پێوە دیاربیت و شتێکی دەست کردو دروست کراو نەبێت. جالێرەدا چەند پرسیارێك دێتە پێشەوە ئایا ئەوقوتابخانە تازەیە چۆن دروست بووەو لەکویّ ؟

ئەو گورو هێزەی چۆن پەیداکردوەو دەبێت لەمێژوی ئەدەبییاتدا چ ناوێك لەوقوتابخانەیە بنێین؟

## بۆ وەڵامی ئەم پرسیارانە دەڵێن

ڕاستی مێژوو ئەوەمان پێ دەڵێت کە پێویستیەکی بابەتیو مێژوویی وای کردکە لە ئەنجامی پەرەسەندنی مێژوویی و کۆمەڵایەتیی و ئابووریی باباندا، پێویست بە شارێکی گەورەو پێشکەوتوو هەبێت کە ببێت بە پایتەختی ئەم میرنشینە دەیویست پەرە بسێنێتو پەل بۆ میرنشینەکانی تری کوردستان بهاوێژێت، ئەو ئاواتەی، بهێنێتە دی، کە بۆ میرانی بۆتانو سۆران نەهاتەدی – ئاواتی یەکخستنی کوردستان.

باری جوگرافی و کۆمەڵایەتی شاری – قەڵاچوڵان– کە پایتەختی پێشووی میرنشینی بابان بوو، لەوەدا نەبوو کە ئەو پایتەختە لێ پەیدا بێت، لەبەر ئەوە هەر لەو نزیکەی شوێنی ئێستای شاری سلێمانی لە هەموو ڕووێکەوە لێی دەهات کە ئەو پایتەختەی تێدا درووست بکرێت بناغەی دانانی شاری سلێمانی لەساڵی١٧٨٤زدا ئەنجامێکی سەربۆری چەند سەدەی کوردیشە لە شار درووست کردن داو دنیا دیدەیی پادشای بابان خۆیشی لە نەخشەکێشانو بیناکردنی شاردا جێگەی خۆی گرت . لەشاری سلێمانیدا هەر لە سەرەتای درووست بوونیدا گەلێك شت پێکهات وەك :

١– شار لەسەر بناغەی زانینو شارستانییەت دروست کرا.

٢– هەندێك دیمەنی شارە پێشکەوتووەکانی ئەو سەردەمەی تێدا دیاربوو.

٣– هەر لە سەرەتای دامەزراندنییەوە پڕۆژەی ئاوو زێرابی تایبەتی بۆ هەموو شار کرا.

٤– چەند چەشنە پیشەسازی تێدا دامەزرا، کە وێنەیان لە سەرەتای ڕاپەڕینی پیشەسازیو پەیدا بوونی پەیوەندی پیشەسازی ئەورووپادا پەیدا

بوو بوون سابوون دروست کردن و چنین و ڕستن و جۆلایی و قوتابخانە و دەباخانە و چەقماخسازی و کارگەچییەتی و گەلێك سونعەتی تر.

٥- شارەکە بوو بە مەڵبەندێکی گەورەی بازرگانیی و پەیوەندی بازرگانیی لەپاڵ پایتەختە گەورە نزیکەکان دا، وردە وردە گەیشتە هەندێك شاری ئەورووپیش . بێگومان ئەو پێشکەوتنە ئابوورییەو ئەو هەوڵە سیاسییە، پێشکەوتنی زانیاریی و ئەدەبیاتیشی لێ دەبێتەوە چەشنە وریایی و هۆشیارییەك لەناو دانیشتواندا دروست دەکات، بۆیە هەر لەسەرەتاوە چەند مزگەوت درووست کران و مزگەوتی گەورە بوو بە مەڵبەندی خوێندن و سەرپەرشتی میری بابان و لەپارەی میرنشینی ڕێ و شوێن بۆ گوزەرانی سەدان فەقێ دانراوە، کە لە هەموو کونجێکی کوردستانەوە دەهاتن و مەلای باشیش لە زۆر شوێنەوە هێنرانە سلێمانی و زانای ئەوتۆ لەو سەردەمەدا لەم شارەدا دەرسیان گوتۆتەوە، کە ناوبانگیان بە هەموو وڵاتی ئیسلام دا بڵاو بۆتەوە. هەروەك جمو جۆڵ و کێشەی نێوان دوو تەریقەی قادریی و نەقشبەندی لەم شارەدا لەسەردەمی بابان دا بە دیمەنێکی تری بزوتنەوەی بیری ڕوناکی و ڕاپەڕین و چالاکی جولاندنەوەی ژیانی ئەو سەردەمە دادەنرێت.

بێگومان لەم زەوییە بەپیتەدا، بزوتنەوەیەکی ئەدەبی تازەش بەرپا دەبێت و پەیرەوێکی ئەدەبی تازە، یاچەند پەیڕەو دیتەکایەوە، گرنگ و مەشخەڵی پەیرەوێکی ئەدەبیی نوێ لەسلێمانییەوە سەری دەرهێنا.

قوتابخانەی شیعری بابان، کەهەندێك لەشارەزایانی ئەدەبیاتی کوردی بەقوتابخانەی (نالی)ی دادەنێن و، هەندێکیش، ناوی (نالی و سالم، کوردی) پێکەوە دێنن و بە (سێکوچکەی بابان) یان ناودەبەن، ئەگەر لەڕووی

ناوەرۆکــەوە گــەلێك دیمــەنی ئەوقوتابخانەیــە لەئــەدەبییاتی ئەمڕۆمانــدا نەمابێت، ئەوا لەڕووی ڕوخسار و زمانــەوە ئــەدەبیاتی ئــەمڕۆمان، هەربــەرەو پێش چوونی مێژوویی ڕووخساری ئەدەبی ئەوقوتابخانەیە.

هونەرمەندی و مامۆستایی (نالی)، توانایەکی وای بەخشی بەبەرهەمی خۆی و دوو هەڤاڵەکەی کە زوو بڵاو ببێتەوەو بچێتە دڵەوەو کاربکاتە سەر شـاعیرانی تـری ناوچـەی کوردسـتان ئەودەنگـەی لەسلێمانییەوە بـەرزبووەوە، دەنگـی دایەوەو دەنگ دانەوەکەشی لەیەکەم پلـەدا لەناوچـەی سـۆران (هـەولێر)ەوە بوو.

هەرلەو سەردەمەدا شیعری حاجی قـادری کۆیی (١٨١٧–١٨٩٧) و ئەختــەر (١٨٣٩– ١٨٨٧) و کــەیفی لــەخاکی ســۆرانەوەو مەجــدی (١٨٤٩–١٩٢٥) لەئەردەلانــەوەو کۆمــەلێك شـاعیری تـری ناوچـەی سـنەو موکریـان هەربــەو چەشنەیان نووسیووە کە نالی و هەڤاڵەکانی نوسیویانە.

ئەو بناغەیەی (نالی) داینـا، لـەپاش لەناوچـوونی میرنـشینی بابـان نـەڕووخا، بەڵکو هەربەرەو پێش چوو.

## سەرەتا و دەست پێ کردن:

زۆرجار، کەباسـی شـیعری نـالی و قوتابخانـەی نـالی دەکرێـت پرسـیارێك دێتە پێشەوە . ئەویش ئەوەیـە کەچۆن دەگونجێـت زمانێـك یـا دیـالێکتێکی زمانێـك لـەوە پـێش شـیعری پـێ نـەگوترابێت، بـەڵام سـەرەتاکەی لـەڕووی ناوەرۆك و ڕوخسارەوە بەم چەشنە پتەوەبێتە کایەوە؟.

ئەم پرسیارە زۆر لەجێی خۆی دایـە و بەتــەواوی لەگـەڵ مـەنتیقو زانـست دا دەگونجێت.

بێگومان ئێمه نالی بەرابەرو دامەزرێنەری قوتابخانەی شیعری بابان دادەنێین
.ئەگەربەرهەمی نالی، لەرووی ناوەرۆك و ئەو باسانەوە کەشیعری دەربارە
گوتووە، تەواو تازە نەبن و لەناوەرۆکی شیعری کلاسیزمی دیالێکتەکانی تری
کوردی و شیعری کلاسیزمی رۆژهەلات بچن، ئەوا لەرووی زمانەوە تازەن.
دیارە ئەم تازەییە واناگەیێنێت کەپێش نالی هیچ جۆرە شیعرێك بەو دیالێکتە،
واتە بە (بەشی سلێمانی کرمانجی خواروو) نەگوترابێت. بەڵکو ئەمەی نالی
بەچەشنێك خۆی گرتووە و جێی خۆی کردۆتەوە کە لە پتەوی‌دا ببێتە
بناغەیەکی ئەوتۆ کەلێ لادانی نەبێت و شاعیرانی تر پەیرەوی بکەن و
نەچنەوە سەر شێوەکانی تر، یانەچنەوە سەر ئەو زمانانەی تری رۆژهەلات
کەهەندێك شاعیری کورد شیعریان پێ گوتوە (بەتایبەتی فارسی).

زانستو مەنتیق لەگەڵ ئەوەدایە کەپێش نالی سەرەتایەکی ئەوتۆ هەبێت کە
وردە وردە ئەو بناغە پتەوە بەهێزەی لێ پەیدابووبێت و بلیمەتی نالی و دوو
هاوەڵەکەی وای کردبێت کەئەو سەرەتا ساکارانە بکەن بەم بناغە بەتینە
قووڵە نەلەرزیوە.

بەداخەوە باری مێژوویی کورد وای کردووە کەزۆربەی بەرهەمی گەلێك
شاعیری ناودار و بێ ناومان ون ببێت یا بسووتێت. لەبەرئەوە زۆربەڵگەو
نموونەمان بۆنەماوەتەوە کەناویان بنێین سەرەتای ساکاری قوتابخانەی نالی،
بەلام لەگەڵ ئەوەشدا هەندێك نموونە هەرهەن کەببن بەبەڵگەی بوونی
ئەوسەرەتایە، کەدیارترینیان ئەمانەن:

١- ئەگەر بە وردی لەوبەرهەمانەی ئەدەبیاتی فۆلکلۆر بکۆڵینەوە
کەتائێستا تۆمارکراون، یابگەرێین بەدوای بەرهەمی تۆمار نەکراوی
فۆلکلۆردا، ئەوا گەلێك بەرهەمی وامان دەست دەکەوێت کەبەپێی رووداوی

مێژوویی و هەندێك دیمەنی ترییەوە، بڕیاری ئەوەیان بەسەردا بدەین کە بەرهەمی پێش (نالی) ن هەر بە دیالێکتەکەی ئەویش گوتراوە.

٢- هەرچەندە تائێستا بەتەواوی ساڵی لەدایك بوون و مردنی (عەلی بەردەشانی)مان بۆساغ نەبۆتەوە، بەڵام هەموو بەڵگەکان لەگەڵ ئەوەدان کەعەلی بەردەشانی پێش نالی کەوتووە و ڕەنگە ماوەیەك ژیانیان پێکەوە ببێت. لەبەر ئەوە دەتوانین بەرهەمی عەلی بەردەشانی کەشیعری میللییە بەسەرەتایەکی سادەی بەرهەمی نالی دابنێین، تەنانەت ئەگەر لەشیعری عەلی بەردەشانی بکۆڵینەوە دەتوانین هەندێك لێکچوون و پەیوەندی لەنێوان ئەوو بەرهەمی نالی داو گەلێك پەیوەندی لەنێوان ئەوو سالم دا بدۆزینەوەو. بەتایبەتی لەڕووی باس و ناوەڕۆکەوە هەرچەندە لەڕوخساردا جیاوازیان هەیە.

٣- (مەولوودنامەی) شیخ حسێنی قازی (١٧٩١-١٨٧٠)[1] بەیەکەم بەرهەمی پەخشانی کوردی دادەنرێت. بەداخەوە تائێستا ساڵی نووسینی ئەم مەولوودنامەیە نازانین، بەڵام ئەوە دەزانین کەشێخ حوسێنی قازی بەتەمەن لەنالی گەورەترە لەڕووی بەرهەمی ئەدەبییەوە هاوچەرخی ئەوە. ئەگەر مەولوودنامەکەی بەسەرەتا دانەنرێت بۆ شیعری نالی ئەوا بەدیاردەیەکی ئەدەبیی وادادەنرێت کەلەو زرووفە مێژووییەدا پەیدابووە کەشیعری نالی تێدا پەیدابووە.

---

(1) دەرکەوتووە کەنووسینەکەی تەرەماخی- تەرەمۆکی)کەلە ساڵی١٥٩١- ١٥٩٣ز نووسراوە یەکەم پەخشانی کوردییە.

# نـــــــــالی

## (١٨٧٣-١٨٠٠)

### ژیان و بەرهەم:

نالی ناوی مەلا خدرە کوڕی ئەحمەد شاوەیسی ئالّی بەگی میکایەلّی یە میکایەلْ یەکێکە لە تیرەکانی عەشیرەتی جاف لە گوندی (خاك و خۆلْ) لە دەشتی شارەزووردا لە دایك بووە، بۆ خوێندن چۆتە قەرەداغ و پاشان فەقێیەتی لە سلێمانی لە (خانەقای مەولانا) تەواو کردووەو ئیجازەی مەلایەتی وەرگرتووە، نالی بە چاوی خۆی لوتکەی گەشەسەندن و پەرەسەندنی فەرمانڕەوایی بابانی دیوە٠ لەکاتێکدا چووە بۆ حەج و لە ڕێی گەڕانەوەدا لە شام هەواڵی ڕووخاندنی میرنشینی بابان و هێرشی عوسمانییەکان و داگیرکردنی سلێمانی دەبیستێت٠ ئیتر بڕیاری نەگەڕانەوە دەدات و ڕوودەکاتە ئەستەمبۆلْ و هەر لەوێ بە داخی نیشتمانی و دووری نیشتمانەوە سەردەنێتەوە.

### بەرهەمی:

وەك گوتمان، ڕەنگە لە ڕواڵەت دا شیعری نالی بە تازە دانەنرێت، یا بە دیمەنێکی تری ئەو ئەدەبیاتە کلاسیزمە کوردییە بزانرێت ، کەبە شێوەی کرمانجی ژووروو لە سەدەی حەڤدەهەم دا گەشەی سەندبوو، یا ڕەنگە هەندێك بە وێنەیەکی کوردی شیعری کلاسیزمی ڕۆژهەلاتی ببینن و تازەیی تێدا نەبینن بەڵام ئەمانە هەموو لە ڕاستییەوە دوورن، (نالی) ئەگەر هیچی نەکردبێت، هێزو توانای فراوان و بە ئیبداعی زمانی کوردی لە دەربڕیندا دەرخستووە، لە ناو کوردیشدا بە پیت و پتەویی وشەی دیالیکتەکەی خۆی بە جۆرێك پیشان داوە کە ببێت بە بناغەی یەکگرتنی زمانی ئەدەبیی کوردی.

بەڵێ، وشە زۆر جار لای نالی گەلێك مانای هەبووە، وەك هەموو شاعیرانی کلاسیزمی جیهان خەریکی ((وشەکاری)) و ڕازاندنەوەی وشە و بە چەند مانا بەکارهێنانی وشە بووە، بەلام ئەگەر ئەم وشەکارییە لای شاعیرانی تر چەشنێك یا دیمەنێك بووبێت لە دیمەنەکانی توانای ئەدەبی خۆیان، یا هەر ئەدەبیات بەلای ئەوانەوە ڕێگەیەکی کات ڕابواردن و کات بردنەسەر بووبێت، ئەوا لای ( نالی) ماناو مەبەستێکی قووڵترو ئاسۆیەکی فراوانتری هەیە، کە لەم مەبەستەدا (نالی) لە ئەدەبیاتی ئەم سەردەمەوە نزیك دەکاتەوە.

(نالی) کە شاعیری ڕۆژانی گەشەسەندنی میرنشینی بابانە، ئاگاداری هەموو ئەو جموجۆڵ و تەوژمەیە کە لە دەروونی کۆمەڵگای ئەوکاتەی سلێمانی دا جۆشی خواردووەو ڕووی کردۆتە ئاسۆی بەرینی یەکخستنی کوردستان ٠ ئەم شاعیرە ڕابەرەش وەك بیەوێت بە وشەی کوردی و بە بناغەی وشەی ناوچەکەی خۆی بێت بە بەشێك لەو تەوژمە و بە وشەیەکی باڵدار بگاتە ئەو پەڕی سنووری کوردستان٠ ئەگەر ئەمڕۆ ئێمە هەندێك دیمەن و وشەو مانای شیعری نالی بە کۆن بزانین، چونکە لە پاش خۆی زۆر دوبارە کراونەتەو،ئەوا لەکاتی خۆیدا هەمووی تازە بووە٠ وەك لەهەموو سەردەمێکدا بەرەی کۆن بە چاوی سەیر و نارەزاییەوە تەماشای تازە دەکات، ئەوا لەڕۆژانی (نالی) یشدا زۆر کەس بەنارەزایی و سەرسوڕمانەوە تەماشای ئەم چەشنە شیعرەتازەیە وئەم زمانە تازەیەیان کردووە، یا لایان سەیر بووە، کە بە کوردی شیعر بنووسرێت.

(نالی) لەوەڵامی ئەمانەدا دەڵێت:

**١- تەبعی شەکـــرباری من کوردی ئەگەر ئینشادەکـــا**
**ئیمتحانی خۆیە مەقســـودی، لەعەمدەن وادەکـــا**
**٢- یالەمەیدانی فەساحەتـــدا بەمیسلی شەهســـوار**
**بێ تەئەمول بەو هەمـــوو نەوعە زبانی ڕادەکـــا**
**٣- کەس بەئەڵفازم نەڵـێ خۆکردییە خۆکوردییـــە**
**هەرکەسێ نادان نەبێ خۆی تالبی مەعــنا دەکـــا**
**٤- بێتە حوجرەم پارچە پارچە موسوەدەم بکرێ بەڕۆح**
**هەرکەسێ کوتاڵ و پارچەی بـێ بەدەل سەودا دەکـا**
**٥- شیعری خەلقی کەی دەگـاتە شیعری من بۆنازکـــی**
**کەی لەدیقەتدا پەتك دەعوا لەگەڵ هەودادەکـــا**

(سێ دێری یەکەمی بۆلەبەر کردنە)

(نـالی)بـەم بـیرە وردە قووڵـەوە و بـەم خـوێن گەرمییـەوە لەسـەر وشـەی خۆشەویستی کـوردی دەکاتـەوە٠ ڕەنگـە لـەپاڵ هـەموو نارەزاییـەك دا پێـی گوترابێـت، شـیعر بـەکوردی نانوسـرێت،بەڵکو بـەزمانی تـری ڕۆژهـەلأت دەنووسرێت٠ یاشاعیر ئەوەیە کـە بـە چـەند زمانێـك شـیعری هـەبێت٠ دیـارە لەشیعری کۆندا وەك زۆر مەرج و سنوور و پێوەند بۆ شاعیر دانراوە و ئەوانـە کراوون بەمەرجی شـاعیرێتی٠ بەچـەند زمـان شـیعر گـوتنیش مـەرجێك بـووە بۆدەرچوونی شاعیر لەتاقی کردنەوەدا٠ (نالی) زۆر بێ باکانە و بـەتوانا چۆتە ئـەوتاقی کردنەوەیـە و بەچـەند زمــان شـیعری گوتــوە و لــەم مەیدانــەدا بەشانازییەوە گوتوویە

**فارس و کورد و عەرەب هەرسێم بە دەفتەر گرتووە**
**نـالی ئەمڕۆ حاکمی سێ موڵکە دیـــوانی هەیـــە** (بۆ لەبەرکردنە)

## ناوەرۆکی شیعری نالی:

ئەگەر بە وردی بمانەوێت دەست نیشانی ناوەڕۆکی شیعری نالی بکەین، ئەوا سێ مەبەستی گەورەو دیار لە شیعرەکانی دا دەبینین.

### ١- دڵداری:

زۆری بەرهەمی (نالی) لە دڵداری دەدوێت ٠ شارەزایانی ئەدەبیاتی کوردی خۆیان بەوەوە خەریك کردووە ، کەئایا ئەو سۆزو هەستەی لە شیعری نالی‌دایە ، سۆزی دڵدارییەکی ڕاستەقینەیە یا هەروەك هەموو شاعیرانی کۆن، بۆ پیشاندانی توانای شاعیرییەتییە، بەوە کە دەبێت لە هەموو باسێك بدوێت، ڕێگەی شیعری دڵداریشی گرتووە، ڕاستی ئەمە هەرچییەك بێت، ئەنجامەکەی ئەوەیە کە نالی یەکێکە لەوانەی جوانترین شیعری دڵداری کوردییان نووسیوە، شیعری دڵداریش بەشی هەر گەورەی بەرهەمی نالییە لە پاڵ سۆز و ڕاستەقینە و ڕاستگۆیی و دەربڕینی هەستی ناسکی دەروون دا، هەر بە دەم هەست دەربڕینەکەوە، وەسفێکی بەرز و جوان و وردی ئافرەت هاتۆتە ناو شیعری کوردی یەوە، کە لەم مەیدانەشدا(نالی) کردووە بە ڕابەری ڕێبازێك. دەتوانین بۆ نموونەی ئەم مەبەستە لەم پارچەیە تۆمار بکەین کە دەڵێت:

**١- زوڵفت لە لە قەدت دا کە پەرێشــان و بڵاوە[1]**
**ئەمڕۆ لە منــی شیفـــتە ئاڵۆز و بــەداوە**
**٢- بۆچی نەگریم سەد کەڕەتم دڵ دەشکێنـــی**
**مەی بۆ نەڕژێ شووشــە لە ســەدلاوە شکـاوە**
**٣- عومرێکی درێژە بە خــەیالی سەری زوڵفت**
**ســەوداو پەرێشانم و ســـەودایەکی خاوە**
**٤- هەرچەندە کە ڕووتم بەخوا مـایلی ڕووتـم**
**بێ بەرگییە عیللەت کە هەتیو مەیلی هەتاوە**
**٥- هەر جۆگەوو جۆبارێ کەوا سوورو سوێربێ**
**جێی جۆششی گریانی منە، خوێن نـــەڕژاوە**
**٦- بێ فائیدەیە مەنعی من ئێستاکە لە گریان**
**بۆ عاشقی بیـێچارە زوو ئەم ئــاوە ڕژاوە**
**٧- سۆزی دڵمە، باعیســی تاوو کـوڵی گریــان**
**مەعلوومە کە ئاگر سەبەبی جـۆششی ئــاوە**
**٨- ( مانی ) نییەتی قووەتی تەسویری برۆی تۆ**
**ئەم قەوسە بە دەستی موتەنەفیس نەکشاوە**
**٩- ( نـالی ) وەکو زوڵفت کە موتیعی بەری پێتـە**
**تێکی مەشکێنــە بە جەفاو مەیخــەرە لاوە**

(لەسەرەتاوە چوار دێری بۆ لەبەرکردنە)

---

(١) لە هەندێك لە نوسخە دەستییەکانی دیوانی (نالی) جیاوازییەك لە ڕیزکردنی بەیتەکانی ئەم پارچە شعرەدا هەیە، بۆیە لەوانەیە جیاوازییەك لە دیوانە چاپکراوەکانیش دا هەبێت، بۆ نموونە سەیری لاپەڕەکانی٥٢٢،٥٢٣، ٥٢٤، ٥٢٦، ٥٢٧، بکە لە دیوانی نالی، لێکۆڵینەوەو لێکدانەوەی مەلا عەبدولکەریمی مدرس‌و محەمەدی مەلا عەبدولکەریم (چاپی بەغدا١٩٧٦).

## ٢- ستایشی ئاینی:

ڕەنگە بتوانین بڵێین شیعری ئایینی لە پێش نالیدا بریتییە لە هەندێك شیعری مەزهەبی - ئەویش ئەوەیە کە لای شاعیرانی دیالیکتی گۆران (هەورامی) دا دیارە٠ یا بریتییە لە شیعری سۆفییەتی (تەسەوف) کە زۆر باش لە بەرهەمی مەلای جزیری و فەقێی تەیران دا دیارەو لە (مەم و زین) ی خانی دا دەگاتە لوتکە. بەلام ئەو چەشنە شیعرە لە بەرهەمی (نالی) دا شێوەیەکی تری هەیە.

نالی ڕێگەی ستایشی پێغەمبەری گرتووە . نالی موسولْمان هەست و خۆشەویستی خۆی بەرامبەر پێغەمبەر و خاکی مەککە و مەدینە دەردەبڕێت و دەگاتە ئەوەی کە خۆی بە سەگی بەر ئەو ئاستانە بزانێت کە دەڵێت :

**١- ئەگەر چی کوردی دەوری شارەزووری قەسوەتم ئەمما**
**وەسیلەم (تیبە)[1] وو حیلمی شەفیع و فەزلی مەننانە**

**٢- بەسەر هاتوومە ئەو خاکەی کە هەر مسقالە زەڕەیێکی**
**بە میزانی شەفاعەت کێوی حیلم و بەحری غوفرانە**

**٣- نەبوو ڕووم بێمە خاکی چاکی پاکی تیبە تابیستم**
**بەسەگ نابێ مولەوەس ئاوی زەرقا بەحری ئیحسانە**

**٤- چ زەرقا بۆ سیاهی دەفتەری هەر ناصیە ماحی**
**چ تیبە بۆ تەباهی دەردی هەر دەرماندە دەرمانە**

**٥- دەری ڕەحمەت کەوا بەحری موحیتە عاسی یە (نالی)**
**تێدا جان و تەن ئیفتادەی شەپۆلی سەیلی عسیانە**

(لە سەرەتاوە سێ دێری بۆ لەبەرکردنە)

---

[1] تیبە : طيبة ، لە مەدینە

بەڵام لەگەڵ زۆری و سۆزی قووڵی ئەم ستایشانەدا لە بەرهەمی نالی دا ناتوانین لە ئەنجامی لێکۆڵینەوەدا بگەینە ئەوەی کە نالی سۆفی بووە. یاخۆی بە ڕێبازێکی تایبەتی تەسەوفەوە بەستووە.
بەڵکو ئاین و موسوڵمانییەتی لە شیعری نالی دا هەستێکی گشتی و خۆشەویستییەکی فراوانی موسوڵمانێکە. لەبەر ئەوەی ئەم چەشنە بەرهەمە بەشێکی گەورەیە لە دیوانی نالی دەبێ جێی تایبەتی بۆ تەرخان بکرێت.

## ٢- نیشتمان پەروەریی:

شیعری نیشتمان پەروەریی کوردی لەخانییەوە دەست پێدەکات وحاجی قادری کۆیی ئاوێنەی سەدەی نۆزدەهەم ودەنگ دانەوەی شیعری خانییە لەئەدەبی کوردیی ئەوسەدەیەدا.
بەلأم ئەگەرخانی وحاجی هەندێك دروشمی ڕێکاوڕێك و ڕوونی نیشتمان پەروەرییان هەڵ گرتبێت وڕۆلی (دەوری) ڕابەرییان لەبزووتنەوەی نەتەوەیی و ئازادیخوازانەی گەلی کورددا بەجێهێنابێت، ئەواشیعری (نالی) و قوتابخانەکەی لەوچەشنە بیرو دەربڕینە بەدوورنەبوون، بەڵکونیشتمان پەروەری لەشیعری ناڵیدا دەچێتە قالبێکی کلاسیزمی نیشتیمان پەروەرییەوە، واتە نیشتمان پەروەریی لای نالی هەستی قووڵی خۆشەویستی خاکی نیشتمانە، پێوەندی شاعیرە بەهەموو بستێك وکونجێکی خاکی نیشتمانەوە: نالی دەڵێت:

**دڵ سیاسەنگ نەبێ مایلی خاکی وەتەنە**[1]

**خاڵی لە علی حەبەشە، ساکینی بوردی یەمەنە**

(بۆلەبەرکردنە)

---

[1] سیاسەنگ: بەردی ڕەش ، یا سیاسنگ بە سنگ ڕەش

تادەڵێت:

**دڵی (نالی) کەئەنیسی قەرەداغە ئێستا**

**داغی سەرچاوە و دێوانە و دار و دەوەنە**



★★★

لووتکەی ئەم هەستەو کوڵ وجۆشـشی خۆشەویستیی نیشتمان لـەدەروونی نالی دا پەنگ دەخواتەوە و لەو نامەیەدا دەردەپەڕێت کەلە شامەوە، بە(بای شەماڵ)دا ڕووە و کوردستانی دەنێرێت.

بەڵام ئەونامەیە بەرهەمی کاتی بەسەر چوونی خەوی خۆشی نیشتمان و ڕووخاندنی میرنشینی بابانە، بەڵام (نالی) لەڕۆژانی فەرمانڕەوایی بابانیش دا ئەوهەستەی خۆی دەربڕیوە. (نالی) پاش کۆچی سلێمان پاشاو هاتنە سەرتەختی ئەحمەد پاشا بەپارچە هۆنراوەیەك هەستی خۆی بەرامبەر بەمیری تازەی وڵات دەردەبڕێت ئەگەر لەمەو دواو پاش ڕووخاندنی بابان و هەڵوێستی بەسۆز و نیشتمان پەروەرانەی نالی ڕەچاو بکەین دەبینین کەئەو ستایشەی ئەحمەد پاشا لەوە ناچێت کەشاعیرێك لە ڕۆژانی ژیان و هاتنە سەرتەختدا بیەوێت بۆمەبەستێك، بە باڵای میردا هەڵ بدات، بەڵکو تەواو لەهەستی هاو نیشتمانییەك دەچێت لە ڕۆژێك دا کەشین وشایی تێکەڵ بێت.

دەتوانین ئەم پارچەیەش بکەین بەوێنەیەك بۆشیعری نالی بۆ ستایش و بۆ نیشتمان پەروەریی لەهۆنراوەوی نالیدا.

دەڵێت:

١- تافەلەك دەوری نەدا سەد کەوکەبـــی ئاوانەبـــوو
کەوکەبەی میهری موبارەك، تەلعەتی پەیـــدانەبوو

٢- تانەگریـــا ئاسمان وتـــەم ولاّتـــی دانەگـــرت
گوڵ چەمەن ئارانەبوو، هەم لێـــوی غونچـە وانـەبوو

٣- تاچەمەن پیـرانە سەرئەسڵـــی درەختـــی لانـەدا
فـەرعی تـــازە خورەم وبـەرزو بڵنـد بـــالآنەبـــوو

٤- تاسلێمانان نەبوونە ســەدری تەختی ئاخـــیرەت
ئەحمەدی موختاری ئێمەشاهی تـــەخت ئارانەبـــوو

٥- قیسە بێ پەردەو کینایەت خۆشە، شاهی من کـەوا
عادڵ بو قەت عەدیلـــی ئەو لە دنیا دا نەبـــوو

٦- بۆ نشینگەی مورغی ڕۆحـــی کە عالـی فیترەتـــە
جێگەیێ خۆشترە لە ڕەوزەی جەننەت و مەئوا نەبوو

٧- وەك قیاسێکی کە موسبەت بێ نەتیجەی بێتەجێ
حەمدولیلا شەه کە عالی جابوو خاڵی جا نەبـــوو

٨- شاهی جەم جاناڵیا (تەئریخی جەم) تاریخییە[1]
تانەلێن لەم عەسرەدا ئەسکەندەری جەم جانەبوو (لەسەرەتاوە چواردێری بۆلەبەرکردنە)

---

[1] ئەگەر (تەئریخی جەم) بەئیملای کۆن (تاریخی جم) بەئەبجەد حیساب بکەین دەکاتە (١٢٥٤) کەئەمە بەهیجری ساڵی کۆچی دوایی سلێمان پاشاو هاتنە سەرتەختی ئەحمەد پاشایە.

## ڕوخساری ئەدەبیی ئەم قوتابخانەیە :

زۆر لە ڕەخنەگران ئێستا (ڕوخسار) و (ناوەڕۆك) لە ئەدەبدا لە یەك جیا دەكەنەوە٠ هەرچەندە ڕوخسارو ناوەڕۆك لە ڕووی بەرزیی و جوانیەوە ئەگەر لە یەك پلە دا نەبن. بەرهەمەكە شاش دەبێت . بەلام دەتوانین بە جیاش باسیان بكەین.

وەك بۆمان دەركەوت لەڕووی ناوەڕۆكەوە،قوتابخانەی ئەدەبییاتی نالی گەلێك لەناوەڕۆكی شیعری كلاسیزمی ڕۆژهەلاتی تێدایە و باسی ژیانی كوردەواری كردووە كەدیمەنی نیشتمان پەروەریشی تێدا پەیدا ببێت.

لەڕووی ڕوخساریشەوە هەموو خاسیەتەكانی هۆنراوەی كلاسیزمی تێدایە:

١- بەكارهێنانی كێشی عەرووز.

٢- هەموو پارچە هۆنراوە كە یەك (ڕەویە)یان هەیە واتە هەموو دێڕەكان بەیەك (پیت) كۆتاییان دێت، هەروەها هەموو دێرەكانی هۆنراوە یەك قافییەیان هەیە.

٣- بەم جۆرە زۆرجار لەتاكە دێڕێك دا مانایەكی تەواو دەبینین. لەكاتێك داكە لەشیعری تازەدا بەهەموو پارچەكە مانا تەواو دەبێت.

٤- بەكارهێنانی هەموو ئەو (وشەكاری) یانەی لەڕەوانبێژی دا بەكارهێنراون. لەمەودوا ڕەوانبێژی دەخوێنن دەتوانن نموونەی هەموو ئەو جوانی و وشەكاری و وشە ڕازاندنەوەیە لەبەرهەمی ئەم قوتابخانەیەدا ببینن.

ڕەنگە بۆ ئەمڕۆ دووبارە كردنەوەی ئەم وشە كارییەی بەلاسایی بژمێررێت، بەلام ئەو كاتەو بۆبەرهەمی نالی و هاوڕێكانی تەواو تازە بوو. چونكە ئەوان شارەزایی خۆیانیان لە ڕەوانبێژیدا بۆدەرخستنی جوانیی وشەی كوردی بەكارهێناوە. واتە مەیدانێكی تازەیان دۆزییەوە بۆتەتبیق كردن وپیشاندانی توانای خۆیان.

زۆرجار کەدێڕێك شیعری کۆن دەخوێنینەوە، بەچەند جۆرێ، لێکی دەدەینەوە. چونکە شاعیر وشەکارییەکی وای کردووە کەبەچەند جۆر لێك بدرێتەوە. جا ئەگەر شاعیری تر خۆی هەر تاقە مەبەستێکی هەبوبێت و ئێمە ئەمڕۆ بە چەند جۆر لێکی بدەینەوە ئەوا (نالی) لەم وشەکارییەدا گەلێ مەبەستی هەبووە ، یا شیعرەکانی وا داڕشتووە کە بیری ئێمە بەلای چەند لێکدانەوەیەکدا بەرێت ، ئەمەش دیمەنێکی تری توانای شاعیرییەتی نالی یە . کە لە باسی ڕەوانبێژی دا گەلێك وێنەی دەخوێنین.

قوتابخانەی نالی بە هەموو ڕوخسار و ناوەڕۆکیەوە تا سەرەتای سەدەی بیستەم بەردەوام بووە لە ڕووی زمانیشەوە تا ئێستا بەردەوامە.

## ڕاڤەکردنی پەیڤان:

زوڵف : کەزی ، بسك ، گیسو

پەرێشان : ئاڵۆزو شێواو

شیفتە : عاشق ، سەرگەردان ، حەیران

بەداوە : داوی زۆری تێدایەو ئاڵۆزە

کەڕەت : جار

مەی : بادە ، شەڕاب

سەودا : عیشقو شەیدایی ، هەواو هەوەس

پەرێشانم : بێ نەوام ، بێ ئومێدم

ڕووتم : بێ جلکم ، بێ بەرگم

مایلی ڕووتم : ئارەزووی ڕووت (دەمو چاوت) دەکەم

هەتیو : مندالّی بێ باوك

جۆبار : جۆگە ، جۆگەلە

جۆشش : هەڵقوڵانی ئاو لە ژێر زەوی بۆسەر زەوی

سۆزی دڵمە : دەردی دڵمە ، سۆزی دڵمە

تاو : هێز(تاوی گریان)= هێزی گریان

سەبەبی جۆششی ئاوە: واتە هۆی کوڵانی ئاوە (جۆشش لێرەدا بە مانای کوڵان دێت).

مانی (٢١٦ز – ٢٧٧ز) وێنەکێشێکی بلیمەت زاناو دانایێکی بێ هاوتا بوو، داوای پێغەمبەری کردووە، لەبەر بیری ئازاد خرایە زیندان، دوای ئازاردانێکی زۆر کۆچی دوایی کرد.

ئەم قەوسە: مەبەستی (برۆ)یە.

موتەنەفیس : گیاندار ، زیندوو، ئادەمیزاد، ئەوەی نەفەس دەکێشێت.

شەککربار : شەکراوی ، شیرین، زۆر شیرین

ئینشا دەکا : دروست دەکا ، یان ، جوان دەنووسێت

لە عەمدەن : بە ئەنقەست ، بە عەمدی

شەهسوار : شاسوار ، سوار چاك

زیانی : زمانی

خۆ کردیە : جەلەبییە، شتێك لە لایەن نەشارەزایێکەوە کرابێت

نادان : نەزان ، بێ عەقڵ

کوتاڵ : قوماش

سەودا دەکا : دەکڕێتو دەفرۆشێت

پەتك : گوریس، پەت

دەعوا : وەستان بەرامبەر

هەودا : کلافەی دەزوو

قەسووەت : سەخت ، ڕەق

بەسەر هاتوومە : لەسەر سەر ڕۆیشتوومەو هاتوومە

نەبوو ڕووم : ڕووم نەبوو ، شەرمەزار بووم

مولەوەس : پیس

ئاوی زەرقا : ئاوی ئاسمان

ناسیە ماحی : نیوچەوان لەناوبەر، ناسیە ، نیوچەوان، ماحی لەناوبەر

بۆتەباهی : بۆ نابووت

دەرماندەر : بێ چارە ، بێ توانا و هێز

دەری ڕەحمەت : دەرگای ڕەحمەت

جان : گیان، ڕوح ، رەوان

تەن : جەستە ، لەش

ئیفتادەی : کەوتووەتە ناو

شەپۆڵ : پێڵ

سەیل : سێڵاو ، لافاو

دەوری نەدا : نەسووڕایەوە

کەوکەبە : ئەستێرەی گەڕۆك ، هەسارە

میهـر : دڵسۆزی، ڕۆژ، خۆر، کەوکەبەی میهری موبارەك= ئەستێرەی موبارەکی خۆر

تەم : مژ ، تەم ومژ

چەمەن : مێرگوزار، سەوزایی

ئارانەبوو : جوان نەبوو

پیرانه سەر : سەردەمی پیری، ڕۆژگاری پیری

ئەسلی درەخت : ڕەگی درەخت، بنچینەی درەخت

خوڕەم : تەڕ و تازە و ئاودار

بالاّ نەبوو : بلند نەبوو

سلێمانان : کوڕی (سلێمان)ە، مەبەست(سلێمان) پاشایە، ئەوەی لەپاش خەباتێکی زۆرتوانی دەسەلاّتی خۆی بەسەرمیر نشینی بابان دا بگرێت.

سەدری : پێشەوای

تەختیٚ ئاخیرەت : ئەو کورسیو تەختەیە کەلەڕۆژی ئاخیرەت خودا لەسەری دادەنیشیٚو دادگا بۆئەم خەڵکە دادەنیٚ، تەختی فەرمانڕەوایی.

ئەحمەدی موختار : یەکێکە لەناوەکانی پێغەمبەر (د.خ)

تەخت ئارا : تەخت ڕازاوە

قیسە : حیکایەت ،قسە

عەدیل : هاوتا

نشینگەی : جێی نشینەوە

مورغ : باڵندە، باڵدار

عالی فیترەتە : تەبعو سروشت بەرزە

ڕەوەز : گوڵستان ، باخ

جەنتەتولمەئوا : بەهەشتی حەفتەم، خۆشترین بەهەشتە

موسبەت : شتێك کە خۆی گرتبێت

عالی جا : شوێنی بەرز، جە بلّند

خالی جا :         شوێنی بەتاڵ ، جە بەتال

جەم جا :         پایە بڵند وەك جەم (جەمشید)

ئەسكەندەر :      ئەسكەندەری مەكدۆنی كە لە ٣٣١ پاش زایینـی لەشـكری (دارا)ی لە نزیك هەولێر شكاند.

جەم جانەبوو :    پایە بڵند نەبوو

# سەرەتای پەخشانی کوردی

ئاشکرایە کە یەکەم دابەشکردنی ئەدەبییات ئەوەیە کە ئەدەب دەکات بە دوو بەشەوە، (شیعر) و پەخشان، لە باسی ئەدەبییاتی عەرەبیدا ئەوەت بۆ دەرکەوت کە شیعر پێش پەخشان دەکەوێت و پێش ئەو پەیدا بووە، دیارە ئەم یاسا گشتییە بەسەر ئەدەبییاتی کوردیشدا دێتە دی، لە کوردیدا شیعر زۆر پێش پەخشان کەوتووە، بەڵام وەك دیادەیەك لە سەدەی نۆزدەیەمەوە پەخشانی کوردی پەیدا بووە.

ئەدەبییاتناسی کوردی، کە دێتە سەر باسی پەخشانی کوردی، (مەولودنامە)کەی شێخ حسێنی قازی (١٧٩١ – ١٨٧٠) بە سەرەتای ئەم بابەتە ئەدەبییە دادەنێت، چونکە تا ئێستا بەرهەمێکی تر نەدۆزراوەتەوە کە پێش ئەمە بە پەخشان نووسرابێت، ئەم کتێبە بریتییە لە گێڕانەوە و دێتە سەر باسی لەدایك بوونی پێغەمبەر (د . خ)، پاشان چەند چیرۆکێکی کورت دەربارەی سوود و گەورەیی مەولود خوێندنەوە دەگێڕێتەوە لەڕووی زمان و ڕووخسارەوە نرخی ئەم کتێبە لەوەدایە:–

١– بە پەخشان نووسراوە.

٢– نموونەیەکە بۆ (سەجع)ی کوردی.

٣– بەجۆرێکی سادە حیکایەت یان چیرۆك دەگێڕێتەوە.

٤– زمانە کوردییەکەی هەر ئەو زمانە تێکەڵەیە کە ئەدەبییاتی قوتابخانەی کلاسیکی پێ نووسراوە، هەرچەندە لە زۆر شوێندا نووسەر سەرەتایەکی بۆ نووسینی کوردی پەتی داناوە، پەیدابوونی پەخشان بەم جۆرە و هەر لە شاری سلێمانیدا بە بەشێك دادەنرێت لەو تەوژم و ڕاپەڕینەی ئەو سەردەمە لە میرنشینی باباندا دەبینرا، واتە هەر ئەو هۆ و زرووفەی قوتابخانەی (نالی)ی هێنایە کایەوە، هەر ئەوەش بوو بەهۆی پەیدابوونی پەخشانی کوردی.

**نموونە:-**

لێرەدا دەتوانین نموونەیەکی جوانی نووسینی کوردیی تۆمار بکەین، شێخ حسێنی قازی پاش ئەوەی باسی بیستنی مژدەی لەدایك بوونی پێغەمبەر (د . خ) دەکات، دەڵێت: ((دەرگای بەهەشت کرایەوە، دەرگای جەهەنەم داخرا، گوڵی بەهەشت خۆشحاڵ بوون، درەخت سوور بوون، کانی بە حەوز بوو، خونچە دەمی دایەوە، کانیی وشك ژیاوە، تەیران هەموو هاتنە خرۆش، سەرچاوە هاتنە جۆش، حۆریان گرد بوون، ویلدانی بەهەشت شەرابەن تەهووریان نۆش کرد، بولبول مەست بوون لەسەر چڵان، نەسیم وەر بوون بەنێو گوڵان، گوڵاڵە سوور بوون، کەوسەر سەرکەوت، زیخی دەرکەوت جۆگەی پڕ بوو، وشکیی تەڕبوو چیمەنی شین بوو، نێرگز ڕەنگین بوو، گوڵی گەش بوو، وەنەوشە ڕەش بوو، نێرگز پشکوت، گیای بزووت، درەختی هاتە میوە، کەوتە دەر، قەسری موزەییەن کرا، ساحیبی موعەییەن کرا، فەرشیان ڕاخست، عەرووسیان داخست، هەوا موعەتەر بوو، بۆن خۆش زۆر بوو....)).

(لە سەرەتاوە بۆ لەبەرکردنە تا (کانی وشك ژیاوە)

هەر لەو ماوەیەدا بەرهەمێکی تر لە سەرووی کوردستاندا بە پەخشان نووسراوە، ئەویش کتێبی (عادات و ڕسوماتنامەی ئەکرادیە)یە کە زانای کورد مەلا مەحموودی بایەزیدی کە لە دەوروبەری ساڵی ١٧٩٩ لەدایك بووە نووسیویەتی، کتێبەکە لە ساڵی ١٨٥٨ دا نووسراوە، ئەم کتێبە نموونەی زمانێکی ئاسایی و ساکاری کوردی دیالیکتی کرمانجی سەرووە، باس لەخو و ڕەوشت و ژیانی نەتەوایەتی و کۆمەڵایەتی کورد دەکات. دەستنووسی کتێبەکە لە کتێبخانەی گشتی (لینینگراد) دا تا ساڵی ١٩٦٣ پارێزرابوو، تا لەو ساڵەدا بە زمانی کوردی و بە وەرگێڕانی ڕووسی و بە پێشەکی (مارگریت

ڕۆدینکۆ)وە لە مۆسکۆ چاپکرا شێوەی کتێبەکە ئەومان بۆ دەردەخات کە زیاتر بۆ زانین و یاداشتی شەخسی نووسرابێتەوە، چونکە نووسەر بە قسەی ڕۆژهەڵاتناسی ڕووسی (ئەلیکسەندەر ژاپا) نووسیویەتی و بۆ ئەوی نووسیوە، جا هەر چۆنێك بێت لە ڕووی تۆمارکردنی خوو ڕەوشتی کوردەوە شتێکی بەنرخی بۆ بەجێ هێشتووین و نووسینە پەخشانەکەشی هەرچەندە مەبەستی توانای ئەدەبی پیشاندانی تێدا نییە بەڵام وێنەیەکی ساکاری کوردیی نووسینی بۆ بەجێ هێشووین.

**نموونەیێك:**

(عادەتێکی دن ژی ئەوان ئەکرادێت خۆ جەهی هەین، زڤستانان وەکو دێنە مەجلیس ئەو دکەنە گەرەلاوژ، گەرەلاوژ تاوەکو هەرچەند مرۆڤ دوی مەجلسیدا حازر هەین، ماقوڵ و مەزن و بچووك، حەموو دێ هەریەك بەندەکی ئستراني لابود بە بێژیتن، ژ سەرێ مەجلسێ دەستپێدکەن حەتتا دووماهیا مەجلیس، شایەد وەکو مێوانەك دوی مەجلیسی پەیدا بەبتن بێچارە بە ئەلبەتە ئەو مێوان ژی دێ بەندەکی ئستراني ژ بۆ وان ببێژیتن، نەگۆتی ئەلبەتە نابتن. ئەو ئەکراد ژی ڤی بەندا ئستراني ڕاگیسك دبێژن، ئەلبەتا مێوان ژی دێگیسکە مەجلیسی بدەتن).

(لەسەرەتاوە بۆ لەبەرکردنە تا دوماهیا مەجلس)

## لێکدانەوەی وشەکان :

| | |
|---|---|
| دنی ژی: | هی تریش |
| ئەکرادێد خۆ جەهی: | کوردانی نیشتەجێ. |
| هەین: | هەیە |
| زڤستان: | زستان |
| گەڕەلاوژ: | گەڕەلاوژە، هەراوهۆریا و تێکەڵی |
| مرۆڤـ : | پیاو. |
| مەزن: | گەورە |
| دی: | ئیتر |
| بەندەکی: | پارچەیەك |
| ئستران: | ستران، گۆرانی |
| دوماهی: | دوایی |
| مێوان ژی: | مێوانیش |
| ڤی: | ئەو |
| ئێسك: | گەسك |

بێگومان ئەم کتێبەی مەلا مەحموودی بازیدی کاری نەکردووەتە سەر بەرەوپێشچوونی ئەدەبیاتی کوردی چونکە لەکاتی خۆیدا بڵاو نەکرایەوە، تەنانەت لەبەریشی نەنووسرایەوە و هەر ئەو دەستنووسە هەبوو کە لەم دواییە بڵاوکرایەوە.

بەڵام بزووتنەوەی ئازادیخوازانی کورد لە دوا ساڵانی سەدەی نۆزدەیەمدا، هۆیەکی تری بۆ خەبات و شێوەیەکی تری بۆ دەربڕینی بیری سیاسیی و کۆمەڵایەتیی خۆی دۆزییەوە کە ئەویش ڕۆژنامەی کوردییە.

ڕۆژنامەی کوردی، ئەو سەردەمە و ئێستاش زۆر شێوەی ئەدەبیی هەیە، تەنانەت لە نووسینە سیاسییەکانیشدا شێوازی ئەدەبی دەسەڵات بەسەر نووسەردا دەکێشێت، لەبەرئەمە پەیدابوونی ڕۆژنامەگەریی کوردی بە سەرەتای پەرەسەندنی پەخشانی کوردی دەزانرێت، یەکەمین ڕۆژنامەی کوردی، ڕۆژنامەی (کوردستان) بوو، کە لە ڕۆژی ٢٢ ی نیسانی ١٨٩٨ دا لە قاهیرە (میقداد مەدحەت بەدرخان) دەری دەکرد و پاشان لە جنێڤ و ئەستەمبوول دەدەچوو، لەپاش ئەمە گۆڤاری (ڕۆژی کورد) لە ئەستەمبوول لەساڵی ١٩١١ دا بڵاوکرایەوە، ئینجا گۆڤاری (بانگی کوردستان) هەر لە ئەستەمبوول ساڵی ١٩١٣ بڵاوکرایەوە.

ورده ورده لەگەڵ دەرچوونی ڕۆژنامە و گۆڤاری تازەدا پەخشانی کوردی دەستی بە پەرەسەندن کرد، بابەتی تازەی پەخشان هاتەکایەوە، لە وتاری سیاسییەوە کە بە شێوازێکی ئەدەبی دەنووسرا بۆ وتاری کۆمەڵایەتی و پارچەی ئەدەبی، تا لە ڕۆژانی فەرمانڕەوایی شێخ مەحموودی نەمردا چیرۆکی کوردی سەری هەڵدا چیرۆکی کوردی چەند بابەت و چەند پلەی خۆی هەیە، هەروەك لە پاڵ چیرۆکدا وتاریش بەرەوپێش چووە.

# مێژووی ڕۆژنامەگەری کوردیو پەیوەندی بە گەشەسەندنی پەخشانی کوردییەوە تا شۆڕشی ١٤ی تەمووزی ١٩٥٨ لە عێراق

## سەرهەڵدان و کوردستانی دایك:

لە کۆنەوە تا کۆتایی سەدەی نۆزدەهەم زمانی کوردی تەنها زمانی گفتوگۆو شیعر بوو نەك نووسینی پەخشان، لەبەر ئەوە دەرچوونی ڕۆژنامەی ((کوردستان)) بایەخێکی تایبەتی هەیە لە مێژووی زمانو ئەدەبی نەتەوەکەمان دا چونکە ڕۆژنامە لایەنێکی گرنگو کاریگەری ژیانی ڕۆشنبیرییە و دیاردەییێکی شارستانیو پێشکەوتنە، نیشانەی هوشیاری نەتەوەیە، دیارە ((کوردستان)) لە ٣٠ی زیلقەعدەی ساڵی(١٣١٥)ی کۆچی بەرامبەر بە(٢٢) نیسانی ساڵی (١٨٩٨)ز لە شاری (قاهیرە) لە لایەن (میقداد مەدحەت بەدرخان) نەوەی (بەدرخان پاشا) دەرچووە، پاشانیش لە لایەن (عبدالرحمن بەگ)ی برای دەرچووە.

ڕۆژنامەی (کوردستان) لەماوەی چوار ساڵی تەمەنیدا (٣١) ژمارەی لێ بلاّو کراوەتەوە چونکە دوا ژمارەی، ژمارە (٣١) بووە کە (٦)ی موحەڕەمی ساڵی (١٣٢٠)ی کۆچی بەرامبە بە (١٤)ی نیسانی ساڵی (١٩٠٢)ز دەرچووە، ئەم (٣١) ژمارەیەش لەم شوێنانە دەرچوون :— قاهیرە و جنێف و لەندەن و فۆلکستۆن و، ڕۆژنامەکە بە زمانی کوردی شێوەزاری کرمانجی ژووروو (زاراوەی جەزیرەی بۆتان) بووە، بەشێکی ئەم ڕۆژنامەیە بە زمانی تورکی بوو، تاوەکو کاربەدەستانی عوسمانی لە داوا ڕەواکانی گەلی کورد بگەن.

ڕۆژنامەکە بایەخێکی زۆری بە ئەدەبو مێژوو خوێندنو خوێندەواری داوە، هەروەها هەوڵی داوە کە کورد هوشیار بکاتەوە بیری نەتەوایەنی لە

مێشکی کورددا بچەسپێنێت، داوای بەرهەڵستی زوڵمو زۆرداری کردووە، زۆربەی بابەتەکانی بە پەخشان نووسراوە .

ئەم ڕۆژنامەیە ڕێگەی خۆش کرد کە لە دوای خۆی کاروانی ڕۆژنامەگەری کوردی بەردەوام بێتو ڕانەوەستێت، ئەگەرچی زمانی ڕۆژنامەکەو ڕۆژنامەکانی دوای ئەو، زمانێکی ڕەوانو کوردییەکی پەتی نەبووە، وشەو زاراوەی عەرەبی و فارسی و تورکی تێکەڵاو بووە بەڵام دواتر ڕێگا خۆش بوو بۆ بەکارهێنانی زمانی کوردی پەتی و بژارکردنی زمانی نووسینی پەخشانی کوردی، هەروەها بەردەوام بوونی ڕۆژنامەو گۆڤار بە زمانی کوردی ڕێگای خۆشکرد کە چیرۆکی کوردی سەرهەڵبداتو بەرەبەرە پێش بکەوێت ئەمەش دەقێکە کەوا لە خوارەوەو بە ڕێنووسی ئەمڕۆی دەنووسینەوە کە لە ژمارەی (٥)ی ڕۆژی پێنجشەممە (٢٧)ی موحەڕەمی ساڵی ١٣١٦ کۆچی بڵاوکرایەوە:

**((ژیۆ جەریدەیا کوردستانیێ))**

حەیفامە گەلەك ژکوردیێ مەڕەدهات، من ڕۆژو شەڤ گازنددکرن. چقا کرمانج هەنە حەمی مێرو ژێهاتینە، چرەهولێ بێ مەعریفەت و سنعەت مانە نڤیساندن و خوندنا حەمی کوردا چرەنینە، ئەزلناڤ ڤان کول و دەردا ژار و کالێ ببیم حەیری مابیم، نهۆ ژخودێ تەعالا شوکر دکەم ئەوجەریدەیا تەلسەر قنجیا کوردا دەرێخستی یاتەژمەرە رێکری، هات و کەتەدەست من، حەچکو چقا مراد من هەبین حاسلێ بین قنجی یی لسەر دنێدە حوقادبت مەزنایی لڤی زمانی حوقاچێ دبت، وەکی ئەوجەریدە من خۆند ئەزدەرحەقا دوعا و مەدحێ تەحەیر مام، ئەز ژ خۆندنا وێ تێرنەبیم. من گازی کورد و کرمانجاکر، ژوانرە خوند ئەوژی گەلەك شابین، بەلکە ژ شابینێ لال بین، لناڤ بەینا دووسێ ڕۆژادە حەق بیست جەریدە یا دان هەڤ وژمرا ئانین.

(ئەم دەقە لە سەرەتاوە تا حاصل بین بۆ لەبەرکردنە)

## بەرەو چەسپاندن لە ئەستەنبوول

لە سەرەتای ئەم سەدەیە لە شاری (ئەستەنبۆڵ)ی پایتەختی دەوڵەتی عوسمانی چەند ڕێکخراوێکی ئازادی خوازانە کەوتنە جموجۆڵ و تێکۆشان بۆ بلاوکردنەوەی بیری ئازادی، بۆ ئەم مەبەستە دەستیان کرد بە بلاوکردنەوەی چەند ڕۆژنامەو گۆڤارێك، لەوانە کۆمەڵەی (( هێڤی ))ی کوردی و کۆمەڵەی (تەعالی و تەرەقی کوردی) کەلە کوردە ڕۆشنبیرەکانی دیاربەکر و وان و سلێمانی و هەولێر و کەرکوك و مەهاباد ... پێکهاتبوو کە بە گیانێکی نەتەوەیی کەوتنە دەرکردنی چەن گۆڤار و ڕۆژنامەیەك بە زمانی شیرینی کوردی، کۆمەڵەی (هێڤی) لە ساڵی ١٩١٣ سێ ژمارەی لە گۆڤاری (ڕۆژی کورد) دەرکرد کە بەرگی هەر یەك لە ژمارەکانی بە وێنەی پیاوێکی ناوداری کورد ڕازاندۆتەوە، ئەم گۆڤارە لەلایەن (عەبدولکەریم ئەفەندی) خەڵکی سلێمانی بلاو کراوەتەوە، گوتارەکانی ئەم گۆڤارە بە هەردوو شێوەی کرمانجی ژوورو کرمانجی خواروو بلاو کراوەتەوە، ئەم گۆڤارە کە بە یەکەمین گۆڤاری کوردی دادەنرێت یەکەم چیرۆکی کوردی بە ناوی (شەویش) بلاو کردۆتەوە کە بەشێکی لە ژمارە (٢) و بەشەکەی تری لە ژمارە (٣) بە ناوی نووسەر (فوئاد تەمۆ) یە کە چیرۆکێکی ساکار و نزیکە لە گێڕانەوەی هەقایەتی کوردی و بە شێوەیەکی کرمانجی ژووروو نووسراوە. هەر لەو ساڵانەدا ڕۆژنامەی (کوردستان) لە ئەستەنبۆڵ لە لایەن (سورەیابەدرخان) دەرکراوەتەوە، هەروەها گۆڤاری (ژین) و (هەتاوی کورد) بە زمانی کوردی و تورکی دەرچوون.

## (( ڕۆژنامەگەریی لەسەردەمی حوکمڕانی شێخ مەحموود دا ))

لەپاش کۆتایی هاتنی جەنگی یەکەمی جیهانی بەهۆی سەرهەڵدانی شۆڕشەکانی شێخ مەحموودی نەمر شاری (سلێمانی) بوو بەمەڵبەندی ڕۆشنبیری کوردی، پاشان بەهۆی دامەزراندنی حکوومەتی کوردستان بەسەرۆکایەتی شێخ مەحموود لەساڵی ١٩٢٢ کۆمەڵێك ڕۆژنامە بەزمانی کوردی دەرچوون کەبێگومان زیاتر ڕێگایان خۆشکرد بۆگەشەسەندنی ئەدەبیاتی کوردی بەگشتی و چیرۆکی هونەری کوردی بە تایبەتی ، ئەوە بوو ڕۆژنامەی (بانگی کوردستان ) لە شاری سلێمانی (١٤) ژمارەی لێ دەرچوو کە یەکەمین ژمارەی لە (٢) ی ئابی ١٩٢٢ز دەرچوو هەروەها ڕۆژنامەی (ڕۆژی کوردستان) لە نێوان سالانی (١٩٢٢- ١٩٢٣) (١٥) ژمارەی لێ دەرچووە کە یەکەمین ژمارەی لە(١٥)ی تشرینی دووەمی (١٩٢٢) دەرچوو، سەرنوسەری ئەم ڕۆژنامەیە شاعیر و نوسەر (علی کەمال باپیر) بوو. پێش ئەم دوو ڕۆژنامەیەش ئینگلیزەکان لەشاری سلێمانی ڕۆژنامەی (پێشکەوتن) یان دەرکرد کەهەفتانە دەردەچوو، یەکەم ژمارەی لەڕۆژی (٢٩)ی نیسانی ساڵی ١٩٢٠ بلاّو کراوەتەوە پاشان لەلایەن پیرەمێردی نەمر ڕۆژنامەکانی (ژین) و (ژیان)و(زبان) و (ژیانەوە) بەبەر دەوامی دەرچووە تاسالآنی پەنجا کە ئەم کەلە شاعیرە و ڕۆژنامەکانی دەورێکی دیاریان بینیوە لە بووژاندنەوەی کەلەپووری‌نەتەوایەتی کوردو پێشخستنی چیرۆکی کوردی، یەکەمین چیرۆکی کوردیش بەشێوەی کرمانجی خواروو نووسرابێت بەناوی (لەخەوما)یە کەلەلایەن (جەمیل سائیب)ەوە بەزنجیرەلە ڕۆژنامەی (ژیانەوە)بلاّو کراوەتەوە ئەم چیرۆکە باسی سەردەمی شێخ مەحموودی نەمر دەکات، بەڵام لەبەر چەند هۆیەکی تایبەتی و کەسیی بەخەوێکی ناخۆشی

دادەنێـت، کەئەمــەش لەگــەڵ خواســتی زۆربــەی کـورد ناگونجێـت، چـونکە بێگومان سەردەمی شێخ مەحموود لای هەموو کـوردێکی دڵسۆزو نیـشتیمان پەروەر بەخەوێکی خۆش دادەنرێت ،چیرۆکەکە لـەڕووی زمـان و هونەرییـەوە سەرکەوتووە بەڵام لەڕووی بیرو ناوەرۆکەوە بەسەر کەوتوو دانانرێت ئەمـەش نموونەیـەك لەنووسـینێکی نـاو ڕۆژنامــەی (بـانگی کوردسـتان)ە کەبریتییـە لەفەرمانێکی شێخ مەحموودی نەمر کەلـەژمارە (١٠)ی سـاڵییەکەمی دا واتـا لـەڕۆژی یـەك شــەممەی (٢٣)ی ســەفەری ١٣٤١ ی هجـری و ١٥ ی کـانوونی یەکەمی ١٩٢٢ بلاو کراوەتەوە.

((سورەت ئیدارە ، عەلیەهی ، حەزرەت حکومدار لە مەملەکەتی سلێمانی دا نووسراوە ، لە مەحموود ئیبن سەعید بۆ کافـەی میللـەتی کـورد )) لـە پـاش تەڵەبی سـەعادەت و مەغفـەرەت لـە بارەگـای ئەحەدییـەت بـۆ ئـەم میللەتـە مەزڵومـەی خۆمـان ئـیعلان دەکـەم ، کەلەبـەر بـەعزێ ئەسـباب و عــەوارزی سیاسـیەوە مووددەتێکـە لـە خزمـەتی ئـەم میللەتـە سـادقەی کـوردە دوورو مەهجور مابوون ، ئیمڕۆ لە سـایەی خـوداو ڕوحانیـەتی (مـصطفی) (صـلعم). هیمەتی ئەجداد و لە سایەی نیازو (تفرغ) و قـووەتی ئـەم میللەتـە سـادقەوە گەیشتمە ئەم ڕۆژە موقەدەسـە کـە موەفەقـەن هاتوومەتـەوە ، لـە ئیمـڕۆوە دەستم کردەوە بە تـەدویری پەروانەی حکومەت و موحافەزەی مەوجودییـەت و ئیستیقلالیەتی کوردستـان ، ئومێدو ئارەزوو ئەکەم .هەمووتان بەیەك غایەو مەسلە ك و بێ فاسلە سەعی بـۆدەوامی ئـەم ڕۆژەو کۆشـش بـۆ تـەعالی ئـەم میللەتە ئەکەن، کورد وەکو یەك عائیلە مووتەفیقن و مووتەحیدن لەگـەڵ مـن دا بۆ تـەحکیم و دەوامی ئەم حەقە سەریحەیە کەدەسـتمان کـەوتووە، لازم و فرسەتە سەعی و غیرەت بکەین, ئەی میللەتم ئەمین بن کەزامنی سەعادەت و

مووەفەقیەتی ئەقوام ئیتحادو ئیتیفاقە، وەمیللەتێ کەخوێنی ڕژتبێ بۆ حەقی خۆی قەتعیەن مەحروم و ئەسیر نابێ وەقەراری عالەمی مەدەنییەتیش ئەمەیە کە هەرقەومێو هەر عونسورێ خۆی بەخۆی ئەبێ ئیدارە بکات، ئەوەلەن ئێمە کەمیللەتی کوردین، سانیەن بۆئەم غایەیە قوربانیەکی زۆرمان دا بەئەو شەرتە کەیەك دڵ و یەك زبان و یەك وجودین، بەئیزنی خودا هیچ کەس زەفەرمان پێ نابات وەمنیش تائاخر قەترە خوێن و ماڵی خۆم و ئەولاد و ئەتباعم بۆسەعادەتی ئێوە سەرف کردووە وەتیکرار ئەکەم هیمەت لەئێوە و مووەفەقیەت لەخودا.

حوکمداری کوردستان (مەحموود)

لەسەرەتاوە بۆلەبەر کردنە تا (کۆشش بۆتەعالی ئەم میللەتە ئەکەن)

## ڕۆژنامەگەری کوردی لەشاری (هەولێر) و(ڕواندز):

لەســـالّی١٩٢٥ تـــا١٩٣٢ لەشـــاری ڕوانـــدزیّ مەڵبەنـــدی پاشـــای گەورەومیرنشینی (سۆران)، نەمر(حوسێن حوزنی موکریانی) گۆڤاری (زاری کرمانجی) دەرکرد کەپڕە لەچیرۆکی فۆلکلۆری کوردیو بابەتی مێژوویی دەگمەنو بەپێز ،پاش ئەمەش لەسالّی (١٩٣٥) لەشارە دێرینەکەی کوردستان (هەولێر) گۆڤاری هەفتانەی (ڕووناکی) دەرکرد کەتاسالّی ١٩٣٦ یازدە ژمارەی لیّ دەرچووە، ئەم گۆڤارەش ڕۆلێکی بەرچاوی هەبوو. لەپێشخستنی ئەدەبییاتی کوردی و پەخشانی کوردی لەشاری هەولێری ئەوکاتەدا.

## ڕۆژنامەگەری کوردی لە (بەغدا):

لەسالآنی سیی بەدواوە ئیتر شاری(بەغدا) دەبێتە مەڵبەندی دەرکردنی ڕۆژنامە و گۆڤار بەزمانی کوردی، چونکە زۆرکوردی خوێندەواری زانکۆ لەم شوێنەدا بەیەك گەیشتن، بۆیە لەم سالآنەدا گۆڤارەکانی (دیاریلاوان) و(یادگاری لاوان) پاشان گۆڤاری بەرزی (گەلاوێژ) کە لە نێوان سالآنی (١٩٣٩- ١٩٤٩) بۆماوەی دەسالّ بەبەردەوامیو بیّ وەستان مانگانە ژمارەیەکی لیّ دەردەچوو، لەم گۆڤارەدا، نووسەرانو شاعیرانی بەناوبانگی وەکو(تۆفیق وەهبی) و (محەمەد ئەمین زەکی) و (عەلائەدین سوجادی) و (ئیبراهیم ئەحمەد) و (ڕەفیق حیلمی) و (شاکر فەتاح) و(پیرەمێرد) و (گۆران) و (شێخ محەمەدی خالّ).........هتد گوتارو شیعریان بلآو کردۆتەوە، سەردەمی دەرچوونی (گەلاوێژ) بەسەردەمێکی زێڕین و بووژانەوەو ڕابوون دادەنرێت بۆئەدەبییاتی کوردی بەگشتی و بۆپەخشان و چیرۆکی کوردی بەتایبەتی، هەروەها بزووتنەوەیەکی بەرچاوی وەرگێڕان لەزمانەکانی بێگانە بۆکوردی دەست پێدەکات.

بەتایبەتی لە زمانی ئینگلیزی یەوە بەمەش پەخشانی کوردی وچیرۆکی کوردی گەیشتنە چڵەپۆپە، هەرلەسالآنی ١٩٤٨- ١٩٤٩ لە بەغدا گۆڤاری (نزار) لەلایەن بەهەشتی (عەلائەدین سوجادی)یەوە هەفتانە دەردەچوو کەتێکرا (٢٢)ژمارەی لێ دەرچوو بەزمانی کوردی و عەرەبی، بەیەکەمین گۆڤاری سیاسی کوردی دادەنرێت، نووسەرانی وەکو (شاکرفەتاح و پاکیزە ڕەفیق حیلمی موحەڕەم محەمەد ئەمین و ڕەفیق چالاك) بەشدارییان تێداکردووە.

ئەمەش نموونەیەك لەپارچە پەخشانێکی (پیرەمێرد) لەژێرناوی (دواوانی زەڵم و تانجەڕۆ) کە لە گەلاوێژی ژمارە ( ٤ ) ی (١٩٤٣) بڵاو کراوەتەوە :

**(ئۆخ، بۆیە(مەولەوی)م خۆش ئەوێ و شیفتە و شەیدای سۆزونالەی ئەوم کەپەردەپەردە شوێنە شیرینەکانی خاکەکەم و نیشتمانەکەمی بەفەردیفەردەوە بەفەر و زیبێکی دڵنەوەردەوە پیشانداوم بەسینەما خۆشەویستی ئەوانی چەسپاندۆتە سینەمەوە (کۆی ئاتەشگا)ی وەك ئاتەشگەدەی (زەردەشت) لێهێنامە تین وتاو: ناودڵی برژاندووم، تاڤگەی قەڵبەزەی(زەڵم)ی وا بۆکێشاوم دانەی مرواری بەسەردا پرژاندووم (بارەکەالله) چەرخ، هەی ئافەرین چەرخ پلووسکەی (بافر)ی (عەودالآن)و هەوای (چەمی خواجایی) تێگەیاندم هەر ئەو جۆش‌و خرۆشە بوو کە (مەعدوومی)م لە دیاری (عەدەم) نەبوونیەوە هێنایە سەرکۆی ئاتەشگاو پرشنگی شعرەکانیم خستە تەلی سازوسەمتووری شێوەی کوردی خۆمانەوە دام بە ڕادیۆی چاپخانەی (ژیان) بەهۆی ئەو سەودای دڵبەستەی خاکەکەمانەوە هە شوێنێکی ڕەنگین‌و هەر دیمەنێکی دڵنشین‌و هەر چەشمەندازێکی شیرین‌و هەر لەنجەولارێکی ناوێکی نازەنین ببینم ئەمەوێ پێشانی هەموو دۆستێکی بدەم، بەڵام ئاخ (شیعر) واتە هۆنراوە، نازانم تاچەند و چۆن ئەو زادەی سروشتی ئێزەدییە بهۆنمەوە؟**

لە سەرەتاوە ... تا .... بەسەردا پرژاندووم بۆ لەبەرکردنە

## ڕۆژنامەگەری کوردی لەشام :

لەساڵانی ١٩٣٢ – ١٩٤٢ لەشام و لەشاری (دیمەشق) گۆڤارەکانی (هاوار) (ڕۆژانوو) (ستێر) (رووناهی) لەلایەن هەردووبرا (جەلادەت بەدرخان) و (کامەران بەدرخان) دەردەچوو، بەشێوەی کرمانجی ژووروو کەنووسەرانی بەتوانای وەك (جگەرخوێن) و (عوسمان صەبری) و (نورالدین زازا) و (قەدری جان)..... هتد بەشداریان تێدا دەکرد، دەتوانین ئەم سەردەمە بەسەردەمێکی چیرۆکی کوردی دابنێین بەشێوەی کرمانجی ژووروو، بۆیەکەمین جاریش لە گۆڤاری (هاوار) دەست کرا بەنووسینی کوردی بەپیتی لاتینی، هەروەها کۆمەلێك چیرۆکی بەپێز لە زمانەکانی فەڕەنسی و ئینگلیزییەوە لەلایەن ئەم نووسەرانەوە کراون بەکوردی.

## ڕۆژنامەگەری کوردی لەسەردەمی کۆماری کوردستان لەمەهاباد :

لەسەردەمی کۆمارە جوانەمەرگەکەی کوردستان لەشاری مەهاباد لەساڵی ١٩٤٦ بزوتنەوەیەکی ڕۆژنامەگەری کوردی سەری هەڵدا کەبەسەردەمی زێڕینی ڕۆژنامەگەری دادەنرێت لەکوردستانی ئێران دا.
ئەمەبوو ڕۆژنامەی (کوردستان) و گۆڤارەکانی (نیشتمان) و (هەلاڵە) تەنانەت یەکەمین گۆڤاری منداڵان بەزمانی کوردی لەژێرناوی ((گروگاڵی منداڵان)) دەرچووە کەئەمانەش تەکانێکیان بەپەخشانی کوردی دا، نووسەرانو شاعیرانی بەتوانای وەك (هەژار) و (هێمن) (زەبیحی) و (کەریمی حوسامی) و (حەسەنی قزڵجی) بەنووسینو شیعرەبەپێزەکانیان بەشداریان لەم ڕۆژنامەو گۆڤارانەدا کردووە ئەمەش بەشێکە لەپارچە پەخشانێك کە لە گۆڤاری (نیشتمان) بلاوکراوەتەوە لەلایەن (ع.بێژەن).

**(نەء ، نەء براكان خۆشەويستەكان واگويێم لەئاهو نالەی نيشتمانە كە بە كڕوزانەوە پێم ئەڵێ (ڕۆڵەگيان گريان كاری پيرێژنانە: تادەرگای مردن ومراندن لەسەر پشتانە شێوەن و زاری ئيشی ناپياوو پەستانە! خۆئێمەش خۆمان بەلاوێكی ئازا ئەزانين و مەعنای بەزين نازانين، كەوابوو بابچينە سەرچيابڵندەكانی نيشتمان بەگەوايی ئەوان پەيمانێكی برايەتی ببەستين كەوەكو ئەوچيايانە ڕەنگين، سەنگين بەخوێنی جەرگمان ڕەنگين بیٚ، بۆگەلی هەژاری كورد، دوايی هێنی ژيانی نەنگين بیٚ ببێتە يارمەتيدەری ئێمە بۆمردن و مراندن لەرێگای ڕزگاريدا)).**

( هەمووی بۆلەبەركردنە)

بەهەڵگيرساندنی شۆڕشی ١٤ ی تەمووز لەساڵی ١٩٥٨ دا قۆناغێكی نویٚ لەمێژووی ڕۆژنامەگەری كوردی دەست پیٚ دەكات چونكە لەوماوەيەدا بەهۆی سەربەستی بير و بۆچوون لەسەرەتای شۆڕشەكەدا كۆمەڵێك گۆڤار و ڕۆژنامە بەزمانی كوردی لەبەغدا و هەولێر و سلێمانی و كەركوك دەردەچێت، كەلێرەدا حيزبە كوردييەكانيش ڕۆڵێكی بەرچاويان هەبوو لەپێشخستنی كاروانی ڕۆژنامەگەری و زمانی كوردی بەتايبەتی پارتی ديموكراتی كوردستان و حيزبی شيوعی عێراقی.

## لێكدانەوەی پەیڤان:

بایەخ : گرنــگی

هەنگاو : پێنگاڤـــ

كوردی پەتی : كوردی ڕەهوان ، وشەی بیانی تێدا نەبێت.

گازندە دكرن : گلەییم دەكرد

چقا كرمانج هەنە : چەند كورد هەن.

حەمی : هەمی : هەموو

مێرو ژێهاتینە : پیاوو لێهاتوونە

چـــــڕە : بۆچی ، لەبەرچی

هـــــۆ : وەها، بەم جۆرە

ژارو كال بیبیم : هەژارو پیر بوومە

حەیری مابیم : سەرسام بوومە

ژمە ڕە ڕێكری : بۆ ئێمەت ناردووە

حـــەچـــكو : لەبەر ئەوە

چقامراد من هەبی : چەند نیازو مرادێك كەمن هەمبوون

قنجی : باشی ، چاكــە

لسەر زێدە : لەسەر دنیایێ دا.

حوقادبت : وادەبێت ، بەم جۆرە دەبێت

حوقا چێ دیت : وا درووست دەبێت

من گازی كوردو كرمانجا كر : بانگی كوردو كرمانجانم كرد

ژوانڕە خۆند : بۆ ئەوانم خوێندەوە

ئەوژی گەلەك شابین: ئەوانیش زۆر شادبوون

ژ شابینیْ :	لەخۆشیان ، لەشادییان

ژمرا تین :	بۆ منیان هێنان

شیفته و شەیدا :	عاشق و شەیدا

پەردە پەردە :	چین چین و فەسڵ فەسڵ

بە فەڕ و زیبێکی دڵنەوەردەوە: بەکەڵك و جوانییەکی دڵڕفێنەوە– فەر: کەلك، پیت و بەرەکەت– زیب: جوانی– دڵنەوەرد: دڵڕفێن

چەسپاندۆتە سینەمەوە: لە سنگی من دا چەسپاندویانە، سینە: سنگ

ئاتەشگا: ئاتەش، ئاگر– واتە شوێنی ئاگر کردنەوە یا ئەو شوێنەیە کە لەسەردەمی (زەردەشت)دا ئاگری تیا دەکرایەوەو وەکو پەرستگە بەکاردەهات.

قەڵبەزە :	سویلاوك ، سولاڤ

چەشمەنداز :	دیمەن، مەنزەرە

سروشتی ئێزەدی :	سروشتی خوایی

بەکرۆزانەوە :	بە پاڕانەوە

شیوەن و زار :	گریانو فوغان

بەگەوایی ئەوان :	بەشایەدی ئەوان

سەنگین :	قورس

ژیانی نەنگین :	ژیانی شەرمەزاری.

## مەلای باتێ

ناڤێ وی (حوسێن)ە ول گوندێ (باتەی)ل دەڤەرا هەکاریا لەرۆژهەلاتا کوردستانا باکوور ژدایك بوویە، ئەلکسەندەر ژاپاو گەلەکێن دن دوێ باوەرێ دانە کۆ باتەیی ل سالا (٨٢٠)ێ کۆچی یان ل (١٤١٧)ێ زایینی ژدایك بوویەو لدویف بیروباوەرێن کۆهەین ل سالا (٩٠٠)ێ کۆچی یان ل (١٤٩٥)ێ زایینی ئانکۆ ل سەدێ پازدەهێ وەغەرکریە، هەرچەندە لدوی راوبیرێن هندەك نڤیسەڤانا باتەیی ل سەدێ هەڤدێ چوویە بەر دلۆڤانیا خودێ مەزن. باتەیی ئێکە ژناڤو دەنگترین هۆزانڤانێن کلاسیزمێن کوردێین کوب زارێ کرمانجی یاژووری شیعرو هۆزان ڤەهاندینە، مەلایێ باتەیی ئێك بوو ژ مەلایێن ناڤدارێن کورد وب ناڤدارترین بەرهەمێن وی (مەولوودنامە)یە کۆب بوونا پێغەمبەری (د.خ) گۆتییە.

هونەرەکێ زمانێ سڤكو چەلەنگ بوو، جارنا هۆزانێن دینی دنڤیسین، جارناسازو چەنگ و دەف ل بەزمە یا خۆ ئامادەکرینەو ل هیڤیا دلبەرا خۆیە،جارنا ژی ل گۆشەکێ خەراباتێ روینشتی یە.

### مەبەستێن هۆزانێن مەلایێ باتەیی:

مەلایێ باتەیی، وەکو هۆزانڤانەکێ کلاسیزم، ئەو مەبەستو پەیرەوە گرتییە کۆ هەلبەستەڤانێن کلاسیزم گرتینە، هەر ژبەر هندێ یە، ئەوی هۆزانێن خۆ بۆ ڤان مەبەستێن ژێری گۆتینە:

١. **مەبەستا ئایینی و سۆفیاتی:** وەکی هەمی هۆزانڤانێن کلاسیزم ئەڤ مەبەستە ل نك وی گەلەك گرنگو بەهادار بوویە، هەر ژبەر هندێ پشکا هەرە زۆرێ دیوانا ڤی هۆزانڤانی ئەڤ جۆرە هۆزانە ب خۆڤە گرینەل سەر گۆرێ پیرۆزێ پێغەمبەری(د.خ) ئەڤ هۆزانە گوتیە:

**١- هلۆ ڕابـــه ئەبو لقاسم**
**هلۆ ئەی قاسیدێ ئەكبەر**
**٢- هلۆ فەخرا بەنی هاشم**
**هلۆ ڕابە تۆیی ڕەهبـــەر**
**٣- هلۆ ئەی سەیدێ عالـەم**
**هلۆ ئەی مەفخەرێ ئـادەم**
**٤- ژ ڕەوزێ ڕابە یا خاتەمی**
**ژناڤ وێ مەرقەدا ئەنوەر**

(هەمووی بۆ لەبەركردنە)

٢ .**ئـەڤینی و ئەڤینـداری:** ئەڤـەژی مەبەسـتەكە ژ مەبەسـتێن هۆزانڤـانی، هەرچەندە ئەڤـ مەبەستە گەلەك گرنگ نینە ل نك وی‌و گەلەك جارا ژی دگەل مەبەستا ئێكێ تێكەل دبیت، بەلێ دگەل هندێ ژی پارچە هـۆزانێن ب نـرخ ل ڤێ بابەتی دا هەیە وەك ئەڤـ چەند دێرە:

**عــاشقــێ زولــفا ڕەشم**
**عاشقێ شەیـدایـە زولــف**
**بێ بادە لــەو سەرخوەشم**
**سەرخوەش و سەودایە زولف**
**سەرخوەشم ئەز ڤێ دەمــێ**
**سوهتمـە وێ پەرچـەمــێ**
**چیمەكێ ڕەعنـایە زولـف**

٣. **وەسفا جهو وارێن کوردستانێ:** ئەڤـ هۆزانڤانە شەهسوار بوویە دپێ گوتنا جهو وارێن کوردستانا ڕەنگین، ئەوعاشقێ وەلاتێ خۆبوویە، دڤێ هەڵبەستێ دا، ب دەمێن سالێ ڤەهاندی و بەحسی وەرزێن سالێ دکەت ل کوردستانێ ، دبەحسی زڤستانێ دادبێژیت:

**١- زڤستانێ ئەڤی هۆلـێ**
**ل ڤێ بەرێ ل ڤێ چۆلێ**
**٢- مژێ هاڤێتەدا هۆلـێ**
**کەرۆڤێ گرتی زۆزانـە**
**٣- کەڕۆڤێ گرتی نەسرینە**
**جەمەد شینبوو ل سولینە**
**٤- گریامەتێ ژ بۆئەسمینا**
**پەریشانم ل ڤی حالەی**

(سێ دێڕی لەسەرەتاوە بۆلەبەرکردنە)

٤. **سازومەی و بەزم:**

**مەجلسا بێ سازهەیهەی**
**من نەڤێت ئەزناچمێ**
**بێ دەفو بێ چەنگ و بێ نەی**
**من نەڤێت ئەزناچمێ**
**بەزمەیا بێ یارێ باتەی**
**من نەڤێت ئەز ناچمێ**

(هەمووی بۆلەبەرکردنە)

باتەیی هەروەکی هەمی هۆزانڤانێن کلاسیزم، هۆزانێن خۆ ل سەر کێشێن عەرووزا عەرەبی دانایە، هەروەسا بایەخەکا زۆر ب سەرواو قافیەدایە، ژ بلی هندێ ژی پەیڤێن بیانی، نەخاسمە یێن عەرەبی، گەلەك بکار ئینایەو ڕەوانبێژی و جوانکاری دڤەهاندنێت خودا بەرچاڤکریە .

## ڕاڤەکردنی پەیڤان:

هۆزانڤان : هۆنەر ،شاعیر.

هۆزان ڤەهاندینە : هۆنراوەی هۆنیوە ،شیعری داناوە.

هلۆ رابە : هەستە ،هەڵسەوە.

ئەبولقاسم : مەبەستیپێغەمبەریمەزنی ئیسلامە ،محەمەد(د.خ)

ڕەهبەر : ڕابەر، ڕێ نیشاندەر.

سەروەر : گەورە ،مەزن.

ڕەوزێ : گوڵستان

بێ بادە : بێ مەی ،بەبێ شەراب

سەرخۆەشم : سەرخۆشم

کەفیتمە : کەوتوومە ناو

تۆرا غەمێ : تۆڕی خەموخەفەت.

سوهتیمە : سووتاوم.

ڕەعنایە : جوانە

زڤستانێ : زستانێ

بەڕیێ : دەشتودەر

مژێ : تەم ومژ

هاڤێتە : خستیە، فرێیدا، بلاّوی کردەوە

کەڕوڤیێ : باوبۆران، باوبارۆڤە

گرتی زۆزانە : کوێستانەکانی گرت.

گەلەکێن دن : گەلێکی تر

لدویڤ بیروباوەڕێن کوهەین: بەگوێرەی ئەوبیروباوەڕانەی کەهەن

وەغەرکریە : ئۆغری کردووە مردووە

نڤیسەڤانان : نووسەران

جارنا : هەندێ جار یان جاروبار

أ–بەزمەیاخۆ : لەبەزم و ئاهەنگی خۆیدا

هەلبەستەڤان : هەڵبەستەوان ،شاعیر

گریامەتێ ژبۆ ئەسمینا : گریانمان بۆئاسمان دێ

جەمەد : بەستەڵەك

شین بوو ل سۆلینا : لەسولاوك و تاڤگەكان ڕوایان شین بوو، مەبەستی ئەوەیە ئاوی سولاوك و تاڤگە بوو بە بەستەڵەك

# حەسیب قەرەداغی

## ١٩٢٩ — ١٩٩٧

ناوی (حەسیب شێخ عەلی کوڕی عەبدولرەحمان)ە، شێخ عەلی مەلا و مامۆستای گوند بووە، لە مانگی مایسی ١٩٢٩ ی زایینیدا لە گوندی (سۆڵەی چرچە قەڵا)ی سەر بە ناوچەی قەرەداغ لەناو خێزانێکی هەژاری خوێندەوار هاتۆتە دنیاوە، ئەم خێزانە لە بنەماڵەی شێخانی مەردۆخی قەرەداغە، کە هەر لەمێژە خوێندەوار و زانای ئایینی و پیاوی ناسراویان تێدا هەڵکەوتووە، مزگەوت و کۆڕی مەلا و فەقێیان، مەجلیسی گەرم و بەپێزی شێخان، زیکر و تەهلیلە و ئەڵقەی دەروێشان، گۆرانی و سۆز و مەقام و موناجاتی دەنگ خۆشان، دەف و شمشاڵ و نەی، شیعری سوارچاکی شیعری کوردی (نالی و سالم و مەحوی) و شاعیرانی گەورەی فارسی (سەعدی و حافزی شیرازی)، غەمی هەژاران و جوانی سروشت و ئاو و هەوای بێگەردی ناوچەکە ئەمانە و گەلێك سەرچاوەی تر بناغەی بیر و هۆش و سۆزی (حەسیب) یان دانا.

کۆدەتا شوومەکەی ١٩٦٣ حەسیب قەرەداغیان لەتەك هەزاران تێکۆشەری تردا خستە بەندیخانەوە، کە ئازادیش کرا، نەیانگێڕایەوە سەر کار و ئیشی پێشووی خۆی، لە سالانی شەڕی ناوخۆدا، یەکێك بووە لە چالاکترین ئەو شاعیر و پیاوە ناسراوانەی کە هەردەم لە هەوڵی ئاشتی و ئاشتکردنەوەی لایەنەکاندا بووە ..... تا لە ئێوارەیەکی سارد و تەڕ و تووشدا لە ساڵی ١٩٩٧ دڵە گەورەکەی لە لێدان کەوتوو لە گردی سەیوان نێژرا.

ئەمەش دوو کۆپلەیە لە شیعرەکانی:

١- **پرس و خۆشەویستی ١٩٩١ :**

**ویستم تێبگەم، خۆشەویستی... چەندێ جوانە؟**
**( وەلی ) وتی : بالای ( شەم ) ە**
**( مەم ) یش وتی : ... زین وەری گرت، بەژنی ( مەم ) ە**
**خەجیش وتی : وەك زامەکەی ( سیامەند ) ە**
**مامەیارە وتی : وەکو سەرگورشتەی دوانزە سوارە**
**لەلای حەزرەتی ( مەولەوی ) ش وەکو چاورەشی لای دەوار**
**لەلای منیش وەکو دوو خەمە قورسەکەم ... کەژە و بەهار**
**کوردێ بانگی بەختی دەکرد : ئەرێ زووکە!**
**لە خۆشەویستی جوانتریش، شارە گەرمەکەی کەرکووکە**

(هەمووی بۆ لەبەرکردنە)

٢- بەشێك لە قەسیدەی (ناکۆکەکان) ١٩٤٤:

**کە ئەم دەستم ئەو دەستیکەم بۆ بشکێنێ**
**هەردوو دەستم لەمل دەکەم!**
**کە ئەم چاوم ئەو چاوی دیم بۆ هەلکۆلێ**
**هەردوو چاوم پڕ گوڵ دەکەم**
**ئەم ئاگرە بکوژێننەوە ... نەکوژێتەوە**
**نالی دەڵێ : من کورد نەبووم**
**حاجی دەڵێت : من لە کۆیەدا نەژیاوم**
**قەت دیمەنی هەیبەت سوڵتان وەکو گوڵاو نەکراوەتە نێوچاوانم!**

**خانی دەڵــێ: مەم و زین، مــن نەمنووسیـــوە**
**من بەچاوی قەڵەمیشم مێرخاسی کوردم نەدیــوە!**
**سالم دەڵێ: من و دیوانە و ئاپۆڕای میری دابان؟!**
**پێشــمـەرگەیەکــی خـەم لەکــۆڵ دەڵێــت:**
**مـن و سەمفۆنیای، داستانەکەی چیای دابــان؟!**

(هەمووی بۆ لەبەرکردنە)

بۆ زانین:-

١- شاعیر لە هـەموو بوارەکانـدا شـیعری هەیـە، لەوانـە: شـیعری حەماسـی، دڵـداری، تەسـەوف، سیاسـی، کوردایـەتیی، وەسـفی سروشـت و جـوانی کوردستان، شیعر بۆ منداڵان، شـیعر بـۆ شـانۆ، بـۆ درامـای تەلـەفزیۆنی، بـۆ گۆرانی و سروود.

٢- تائێستا چەندین دیوانی شیعری هەیـە، لەوانـە چـوار بـەرگی (فەرهـەنگی خەم).

٣- لە گەرمەی کارەساتی هەڵەبجـەی شـەهیددا، قەسـیدەی (هەڵەبـشیما)ی نووسی.

٤- لە گەرمەی ڕاپەڕینە مەزنەکەی ئاداری ١٩٩١ دا و لەگەڵ بانگەوازی ئازاد کردنی کەرکووکی گڕ و کڵپەدا، قەسیدەکەی (شـێخ) خـوێنراوە بەناونیـشانی (مـن هـیچ نـاڵێم) کـە لـەو ماوەیـەدا، بـووە وێردی سـەر زمـانی جـەماوەری ڕاپەڕیوی کوردستان.

٥- دارشتنێك بنووسە کە هەردوو جەمسەری شەڕ و ئاشتی بگرێتەخۆی.

## لێکدانەوەی وشەکان :

هەیبەت سوڵتان: چیایەکە دەکەوێتە نزیک شاری کۆیێ.

مێرخاس: پیاو چاک

ئاپۆرا: شین و واوەیلا

# کـــوردی

ناوی مستەفایە و کوڕی مەحموود بەگی ساحێبقڕانە، بەڕای زۆربەی ئەو کەسانەی لەسەر ژیانی ئەم شاعیرەیان نووسیوە،لەساڵی ١٨١٢ ز لە شاری سولێمانی لەدایکبووە، هەرلەوێش خراوەتە بەرخوێندن وهەندێك علوومی ئیسلامیشی لەحوجرەی فەقێیان خوێندووە. کوردی یەکێکە لەو سێ شاعیرە بەناوبانگەی کەڕۆڵێکی گەورەیان گێڕاوە لەئەدەبیاتی کلاسیزمی کوردی بەشێوەی کرمانجی خواروو، لەڕەوانبێژی دا شاسوارێکی بێ هاوتابووە، لەساڵی ١٨٥٠یان ١٨٥١ ز، کۆچی دوایی کردووەو لەگردی سەیوانی سولێمانی نێژراوە.

کوردی، دیوانێکی کەمی بەکوردی لەدوا بەجێماوە، کەتائێستا دووجار چاپکراوە جاری یەکەمیان لەبەغدا لەساڵی ١٩٣١ ز وجاری دووەمیش لەهەولێر لەساڵی ١٩٦١ ز. زیاتری هۆنراوەکانی بەدەوری یەك تەوەرەدا دەسوڕێنەوە کەئەویش هۆنراوەی دڵداری وئەڤینی و خۆشەویستییە، شیعرەکانی هەڵقوڵاوی سۆزێکی دڵداری ڕاستەقینەن، کوردی جوانترین وبەرزترین هۆنراوەی لەم مەبەستەدا هۆنیوەتەوەو وەستایەتی و شارەزایی خۆی تێدا دەرخستووە. بەشی زۆری بەرهەمی کوردی ئەم جۆرە هۆنراوانەن نموونەی ئەم مەبەستەش، ئەم چەند دێرە هۆنراوەن:

**١- چێشتم ئەمڕۆ ژەهری مارو ڕۆحی شیرینم نەهات**
**زەخمی کۆنەم هاتە ژان ومەرهەمی برینم نەهات**
**٢- من غەمم خواردو غەمیش خوێنی جگەرمی خوار**
**بۆیە گریام چەند بەچەند فرمێسکی خۆێنم نەهات**

(بۆ لەبەرکردن)

## ڕوخساری هۆنراوەکانی :

ئەگەر لە هۆنراوەکانی کوردی وردببینەوە، دەبینین هەموو وردەکاری و وشەکارییێکی تێدایە کە شاعیرانی کلاسیزم خەریکی بوونە و بەکاریان هێناوە، بۆیە لە ڕووی ڕۆخساری هۆنراوەکانییەوە ئەم چەند خاڵە دیاری دەکەین.

١. لەهۆنراوەکانیدا وەکو هەموو شاعیرە کلاسزمییەکان پەنای بردوەتە بەرکێشی عەرووزی عەرەبی.

٢. هۆنراوەکانی یەك (ڕەویە) و یەك سەروایان هەیە.

٣. هەموو وشەکارییەکانی ڕەوانبێژی لەهۆنراوەکانی دا بەکارهێناوە، هەربۆیەش بووە شاعیرانی دوای خۆی بەچاوێکی بەرزەوە تەماشایان کردووەو بە (شاسواری بەلاغەتی کوردان ) یان داناوە.

ئەگەر باسی ئەو لایانانەش بکەین کەکاریان کردۆتە سەر ((کوردی))و بەلای هۆنراوەو ئەدەبییاتیان دا بردووە، ئەوا دەتوانین لەم خالانەی خوارەوە کۆیان بکەینەوە.

١. کوردی خۆی لە سروشتی خۆیدا کەسێکی بەهرەدار بووە، شیعر دانان لای ئەو ئەوەندە ئاسان بووە وەکو ئاو خواردنەوە وا بووە بۆی.

٢. لە بنەماڵەیەکی ئەدەب دۆست و شیعرخواز بوو، ئەو بنەماڵەیە لانکەوبێشکەی شاعیرانی وەك ئەحمەد بەگ و سالم بەگ بووە ، دیارە هەڵکەوتنی ئەمیش لەو بنەماڵەیە، هۆکارێکی گەورە بووە بۆ شاعیرییەتییەکەی.

٣. ئاگادارییەکی چاك و تێکەلاوییەکی زۆری لەگەڵ شاعیرانی فارسی زمان هەبووەو گەلێك جار لە کۆڕی شیعری ئەواندا ئامادە بووەو کاریان تێکردووە.

٤. ئاگری دڵداری و خۆشەویستیەکی ڕاستەقینە بووە بە سەرچاوەی ئیلهامی شیعر لای کوردی و ئەم لایەنە بەهێزترین و کاریگەرترین هۆکار بووە، لەبەر ئەوە بەشی زۆری دیوانەکەی گرتۆتەوە.

ئەمەش نموونەیێکە لە هۆنراوەکانی:

**١- چاوەکەم زانیوتە بۆچی خەو لە چاوم ناکەوێ**
**چونکە من پێش خزمەتم پێش خزمەتان نانوون شەوێ**
**٢- ڕۆژ و شەو دایم لەبەردیدەی خەیاڵم حازری**
**ساچ فەرقێکی هەیە بۆمن ئیتر ئێرە و ئەوێ**
**٣- بەس نییە لێرە دەوێرم جار بە جار باست بکەم**
**نەم دەوێرا قەت لەبەر ئەغیارەکە ناوت بەم لەوێ**
**٤- دڵ لەبەر زامی فیراقت دائیما یاری دەکا**
**ڕۆژبەڕۆژ مەنعی دەکەم بازدەردی سەختەوناسرەوێ**
**٥- عەقڵ و هۆشم داوە پێت لێشی دەتۆرێی ماڵوێران**
**دەوڵەتێکی مفت و بێ ساحێبە بۆچی ناتەوێ**
**٦- گەرموخەییەربم لەمابەینی بەهەشتو وەسڵی یار**
**وەسڵی تۆ بۆ من جەهەننەم پرلەجەننەت نامەوێ**
**٧- ئەی ڕەقیب وێڵم لەدەستت لێرە بۆلێم ناگەڕێ**
**باوکە کوشتەت نیم ئەرێ هەی بەد مەزەب چیت لێم ئەوێ**
**٨- هەروەکو کێوی دەماوەندی سەرم پڕ شۆڕشە**
**قەت تەمی هیجران و خەم ساتێ لەدەوری نارەوێ**
**٩- گەردنی (کوردی) لەکێوی بێستون مەحکەم ترە**
**چونکە سەدساڵە لەژێر باری غەمایە نانەوێ**

(لەسەرەتاوە چوار دێری بۆلەبەرکردنە)

## لێکدانەوەی پەیڤان:

| | |
|---|---|
| چێشتم | من خار، من تام کر |
| زەخم | برین |
| دیدەی خەیاڵم | چاڤێ خەیالآمن |
| دەوێرم | دوێرم |
| ئەغبار | دوژمن |
| بازدەردی سەختە | بەلآم دەردی قورسە |
| ناسرەوێ | ناسەکنی، ڕانەوستی |
| لێشی دەتۆرێی | ژوی سل دبی، لێی زیز دەبی |
| مفت | بەخۆڕایی، بەلاش |
| وەسڵی یار | گەیشتن بەدڵدار |
| باوکە کوشتەت نیم | من باوکی تۆم نەکوشتووە |
| مەزەب | مەزهەب ، ئۆڵ، (مذهب) |
| کێوی دەماوەند | کێوێکی سەخت و بڵند دەکەوێتە پشت (تاران)ی پایتەختی ئێران |
| کێوی بێستوون | چیایەکە لەنزیك (کرماشان) لە کوردستانی ئێران |

# کانـــی

(کانی) نازناوی شـاعیری کلاسـیزمی کـورد، عەبدولجـەبار ئاغـای کـوڕی حـاجی مـەلا عەبـدولڕەحمانی کـوڕی حـاجی تـەهای دۆغرەمەچـییە (کـانی) شاعیرێکی چاو نـەترس و ئـازا و نـەفس بـەرز بـوو، بـاوکی زانایـەکی ئـایینی گەورەو ناودار بوو, لە بنەچەدا دەچنەوەسەر بەگزادەکانی جاف، شـاعیر لـە ساڵی ١٨٩٧ لە شاری دێرینی هەولێر لە دایك بـووە، نزیکـەی شەسـت سـاڵ ژیاوە چونکە لە ساڵی ١٩٥٧ کۆچی دوایی کردووە.

(کانی) هەر لە منداڵییەوە باوکی کۆچی دوایی کردووە بۆیە لەو تەمەنـەدا لـە هیچ قوتابخانەیەك نەیخوێندووە کە گەورەش دەبێت بە هاندان و هەوڵی مـەلا تـۆفیقی بـرای و حـاجی مـەلا ئیبراهیمـی مـامی، لـە مزگـەوتی قـەلات دا بـە ماوەیەکی کەم فێری خوێندنەوە دەبێت و چەند کتێبێکی ئایینی دەخوێنێـت لەگەڵ چەند کتێبی زانستی و فەلـەك, هـەر لـە ڕێگـەی زۆر خوێندنـەوەو خـۆ فێرکردن شارەزایی لە زمان و ئەدەبیاتی فارسـی و کـوردی و تـورکی پەیـدا دەبێت، پەیوەندی لەگەڵ چەند ناودارێکی ئەو سەردەمە دەبەستێت و وەکـو (حوسێنی حوزنی موکریانی و گێوی موکریانی) و(میهـری) و(مـەلای گـەورەی کـۆیی) (بێخـود) (دڵـدار)... (کـانی) لەسـەرەتای شـاعیریەتیدا زمانـە ئەدەبییەکەی بریتی بووە لەکوردییەکەی شێوەی هـەلێری تێکـەڵاو بەوشـەی فارسی وتورکی، چونکە لەقەڵای هەولێر پەروەردەبووە، بەڵام دواتر لەڕێگەی خوێندنەوەی کتێبی هەمە جۆرو ڕۆژنامەو گۆڤـارە کوردییەکانـەوە، هـەروەها تێکەڵاو بـوون لەگـەڵ کۆمـەلێك شـاعیرو زانـاو نـاوداری کـوردو، دامەزرانـدنی بەفەرمانبـەر لەشـارەکانی ڕەوانـدوز کۆیـەو شـەقڵاوە زمانـە ئەدەبییەکـەی ڕێکتروبـەتینتر بـووە، کـە ئەگـەر هۆنراوەکـانی بەرامبـەر بـەهۆنراوەکانی

شاعیرێکی سلێمانی یاکەرکووکی وموکریانی ڕابگرین هەست بەجیاوازییەکی ئەو تۆی زمانە ئەدەبیەکەی ناکەین، کانی کاریگەری هۆنراوەی شاعیرە کلاسیزمەکانی وەك (نالی و سالم وکوردی و شێخ ڕەزای تاڵەبانی و ەفایی) زۆر لەسەرە، هەروەها شاعیری تورك (فزولی) بەتایبەتی کەداستانی(لەیلاو مەجنونی) فزولی بەکەمێك دەستکاری وەرگێڕاوە بۆسەر زمانی کوردی، لەئەدەبی فارسیش دا شیعرەکانی (سەعدی) و (شیرازی) بەدڵ بووە. (کانی) هەرچەندە لەدەرگەی هەموو هونەر و بابەتێکی شیعری داوە، وەکو شاعیرێکی کلاسیزمی، لەهەر بابەتێك چەند هۆنراوەیەکی پێشکەش کردووین لەستایش و پێ هەڵگوتن ودڵداری، خۆشەویستی و نیشتمان پەروەری و شانازی بەخۆوە کردن لەگەڵ بابەتەکانی شیعری هۆنیوەتەوە، بەلأم لەهیچ کامێکیان سەرنەکەوتووە, تەنیا لەشیعری مەیو دڵداری سەرکەوتووە گۆی هونەری تیادا بردۆتەوە، چونکە خۆی شاعیرێکی بادە نۆشی عاشق بووە، بۆیە داهێنانێکی باشی لەم دوومەبەستە بەدەست هێناوە لەم مەیدانەشدا شانازی بەخۆی دەکات ودەڵێت:

**١- سەر فرۆ ناکەم بۆعالەم چونکە عالی هیمەتم**
**ناچوێنم بۆهەموو دنیا لەدەستم ڕەغبەتم**
**٢- زاهیرم هەر مەردی مەیدانم وەکو شێری دلێر**
**گوێت لە بەیتم بێ دەکا ئیسباتی نوتق وقوەتم**
**٣- عەسرم ئەبیم حورو سەربەست و فەهیم**
**بێ موحابا شاعیرم مەشهورە (کانی) شوهرەتم**
**٤- نامەردم ئەگەر مینەتی نامەردی بکێشم**
**پێم خۆشترە ئەی (کانی) بە پشتا بەردی بکێشم**

(لەسەرەتاوە سێ دێڕی بۆلەبەر کردنە)

ئەمەی خوارەوەش دەقە شیعرێکی نیشتمانی (کانی)یە کەشاعیر ئەوپەڕی نیشتمان پەروەریی نیشان دەدات بەلاَم بەشێوەیەکی زۆر سادەو ساکار.

((خزمینە وەرن))

**١- خزمینــــە وەرن بەقــوربانی وەتــەن بیــن**
**قوربانی چیــا و دەشت و بیابانی وەتەن بیــن**
**٢- تاکەی لەکــون و قوژبنی وێــرانە بمێنیــن**
**با ئیدی لەسەر کۆششــی عمرانی وەتەن بیــن**
**٣- تاکەی بگرین ئێـــمە وەکو هــەوری بەهاری**
**وەك ڕەعدی سەما دایما تالاَنی وەتەن بیــن**
**٤- بۆچ پێنەکەنین لەم چەمەنستــانە وەکو گــوڵ**
**بۆچ غونچە سیفەت سەر بەگریانی وەتەن بیــن**
**٥- بۆگـەردەن وسینــەو کەمەری دوژمنی بەدخــوو**
**یادەست بەقەمەو خەنجەری بڕانی وەتەن بیـن**
**٦- یاڕەب چ دەبێ ئێمەش ئەگەر هەروەکو بەعــزێ**
**لەشکرشکەن و ڕۆستەمی مەیـدانی وەتەن بیــن**
**٧- تاکەی ئەدوێی (کانی) لە ئەوسافی خەت وخاڵ**
**واچاکە لەمەولا کە غەزەلخوانــی وەتەن بیــن.**

(لە سەرەتاوە چوار دێری بۆلەبەرکردنە)

# مەلا تەهــایێ مایــی

ناڤێ وی (تەها)یە کورێ(شێخ مەزهەر)ێ کورێ (شێخ تەها)یێ  مایییە، ل شواتا ١٩٢٤ ل گوندێ مایێ هاتییە سەردنێ، ژ بنەماڵەکا دیندار و ڕۆشنبیرو کورد پەروەر، ئەڤ بنەماڵە د ڕەگەزدا ژ میرە بەگێن (ئەلکێ) [1] نە، باپیرێ وی ژ شێخێن تەریقەتا نەقشبەندی بوو. هەر ل سالا ١٩٢٤ گوندێ مایێ [2] ژلایێ هێزێن ئینگلیزی ڤە دهێتە سۆتن، بنەمالاوی مشەختی قەزا (چەلێ)ل کوردستانا باکوور دبیت و بۆدەمێ سێ سالان ل وێرێ ئاکنجی دین — هەردڕوودانا سۆتنا گوندی دا پەرتووکخانا مەزنا (شیخ تەها)ی دهێتە سۆتن– پاشان ڤەدگەرنە گوندێ مایێ و دەست ب خواندنا سەرەتایی دکەت لێ نەشیا ڕێزا شەشێ ب داوی بینت چونکە ل دەست پێکا سالا١٩٤٠ ڕەوشا سیاسی و ڕۆشنبیری کارکرە سەر هەست و هزرو بیرێن وی‌و مەلا ئەنوەرێ مایێ ژی زۆر کارکرا سەرو, ژێرە بوو هاندەر لەوڕا دەست ب ڤەهاندنا هۆزانکر و چوو ناڤ ڕێزێن کۆمەڵا (هیوا)و دەست بکارێ سیاسی کر پاشان چوو ناڤ ڕێزێن (پارتی دیموکراتی کوردستان)دا زۆر حەز ژ خواندنێ دکر، نێزێکی (١٥٠٠) پەرتووکان د پەرتووکخانا وی دا هەبوون لەوڕا زانین ڕۆشنبیری یەکا باش پەیدا کردبوو تێکەڵی یەکا باش دگەل زانا و ڕۆشنبیرو ئەدیبان هەبوو، ل سالا ١٩٤٣ پەیوەندی ب بنەمالا بەدرخانیان کریە، (جەلادەت بەدرخان)ی ل شامێ  هەردوو گۆڤارێن (ڕوونـاهی) و (هاوار) دەرئێخستن، هەموو ژمارێن وان ب ڕێ یا

---

[1] (ئەلکێ) گوندەکە ل باکوورێ کوردستانێ، نهو دبێژنێ (بێ شەباب).

[2] (مایێ) گوندەکە ل دەڤەرا بەرواری بالاْ سەرب پارێزگەها دهۆکێ

پۆستەی دگەهشتنە مەلا تەهای ل گوندێ مایێ، (دکتۆر کامیران بەدرخان)ی ل بەیروتێ هەردوو گۆڤارێن (ستێر) و (ڕۆژانوو) دەرئێخستن دیسان ب پۆستێ دگەهیشتنە مەلا تەهای، هەڤالینیەکا مەزن دگەل هەلبەستە ڤانێ ناڤدارێ کورد ئەحمەدێ نالبەند(موخلص) هەبوویە.

هەلبەستێن ڕەوانو نازكو فرە بابەت ڤەهاندینا، ئارمانجا وی یا سەرەکی ئازادیو زانینو زانستو ڕۆشنبیری بوویە، ڕێڤێنگێ ڕێبازا کوردینیێ بوویە لەورا هەردەم ئارمانجا ڕژێمێن دژی کوردستانێ بوویە لەوڕا گەلەك دەربەدەریو هەژاری و نەخۆشی دیتینە، سروشتێ کوردستانێ زۆرکارکردە سەرو د هەڵبەستێن وی دا ڕەنگدایە.

ل سالا ١٩٧٣ دبیتە ئەندامێ ئێکەتیا نڤیسەرێن کورد /تایێ دهۆکێ .

ل سالا ١٩٧٩ بەشدریێ دڤیستەڤالا سێیا هەڵبەستا کوردیدا دکەت ل سولێمانیێ.

ل سالا ١٩٨٧ بەرب ئێرانێ دچیت و دبیتە پەنابەر هەتا سەر هەڵدانا پیرۆزا ١٩٩١ ێ جارەکادن ڤە دگەریتە کوردستانێ و ل بازێڕێ دهۆکێ ئاکنجی دبیت.

ل سالا ١٩٩٥ دبیتە خوەدیێ ئیمتیازا گۆڤارا (پەیڤ).

ل سالا ١٩٩٨ دیوانا خۆیە هەڵبەستا بناڤێ (دل دەرێژکرن) چاپ کر، پێشی وەغەرا دووماهێی بکەت فەرهەنگاوی یا (کوردی- کوردی) تمام بوو لێ نەگەهشت ل چاپێ بدەن.

ل ٢٠٠٠/١١/٢٥ دژیێ (٧٦) سالیێ دا ل بازێڕێ دهۆکێ دچیتە بەر دلۆڤانیا خودێ.

مەلاتەهای ب بیرەوەری یا شەهیدێن دیار بەکریۆ نسکۆیا شورەشا شێخ سەعیدێ پیرانو سێدارەدانا پیران زۆر داخبار بوویەو ئەڤ هەڵبەستە ڤەهاندی یە.

## ((شینیو تازیا شەهیدا))

١- شینیوتازیا شەهیدا ئەم ژبیر ناکەین چوجار
دێ ڤەکەین تۆلا نەهنگا وەختەکێ زێڕین بژار

٢- وان مەغولا ڕاڤ دبەستن شێرو مێر سەر دهنجنین
توخمو نقشێ وان قەلاندن هەمی گاڤا دپەچنین

٣- تورکا گرتن شێرو مێر چاك دەست و پێ لێ قەید کرن
کەت بکەت گرتنو کوشتن لبن سێپێکا خرکرن

٤- ڕستکا شەنقێ بو دانا خەندقاند پارێز وەلات
شێخ سەعیدێ جان فیدا ڕەشە ڕۆژەك بۆمەهات

٥- ئەو ڕوبادێ قەبقەبی چو ئاخ و زاری بوون بلند
چوودلێ شێری ژناڤ مەبێ خودان مان دەشتو گوند

٦- بو ڤێری زێمارو شینی کۆ وەلات مابێ خودان
پۆسیدە دلسۆژو خەمگیر هەر هەوارێ دکەن ئەمان

**٧- نىٚ ژ خەما وە ئەم بهوژتين ئەى شەهيدێن ڕەحمەتى**
**دىٚ ئازاكەين ناڤـ و دەنگا كوردەوارێن بەر كەتـــى**

**٨- با دكەت وە گەلى كوردا شێخ سەعيدىٚ پڕ هۆنەر**
**يەك بين بۆ ڤىٚ وەلاتـــى دا ژژانىٚ بێتـــە دەر**

**٩- ژانەكە قەويا گرانە ئێشەكـە بۆ كەڤـنەريـــش**
**برسى و رويسى هەر نيشانە بۆمە ئەم بىٚ كاروئيش.**

(شەش دێڕ لەسەرەتاوە بۆلەبەر كردنە)

## لێكدانەوەى پەيڤان:

| | |
|---|---|
| ل شواتا | :لەمانگى شوبات |
| سەردنىٚ | :سەردونيا |
| مشەختى | : دەربەدەرى يان ئاوارەيى |
| ئاكنجى دبن | : نيشتەجىٚ دبن |
| ڕێزا شەشىٚ | : پۆلى شەشەم |
| بەدواى بينت | : بەدوايى بێنێت، تەواوى بكات |
| كاركرە سەر | :كارى كردەسەر |
| ژێرە بۆهاندەر | :بۆىبوو بەهاندەر |
| چووناڤـ ڕێزێن | :چووە ناو ڕێزەكان |
| لەو ڕا | :لەبەر هەندىٚ، بۆيە |
| ڕێڤينگ | :ڕێبوار |

| | | |
|---|---|---|
| داخبار بوویە | : | داخدار بوویە |
| ژ بیر ناکەی | : | لەبیرناکەی |
| چووجار | : | هیچ کاتێك، قەت |
| دێ ڤەکەین تۆلا | : | تۆڵەیان دەکەینەوە |
| راڤـ دبەستن | : | راویان هەڵدەبەست |
| سەر دهەنجینن | : | سەریان دەهەنجنێ |
| کەت بەکەت | : | یەك بەیەك |
| سێپێکا | : | سێپایە، سێدارە، قەنارە |
| رستکا شەنقێ | : | پەتی قەنارە، پەتکی خنکاندن |
| خەندقاند | : | خنکاندیان |
| رووبادێ | : | کەوی رووباد |
| ئاخ‌وزاری | : | ئاخ‌وناڵە |
| چوو دلێ شێری‌ژناڤـ مە | : | دڵی شێر لەناومان نەما |
| بۆقیری | : | بووەهاواروقیرە |
| غەمگیر | : | غەمگین |
| نێ ژخەما وە | : | بەلاّم لەخەمی ئێوە |
| برسی‌و رویسی | : | برسیەتی و رووتی |
| توخم‌و نقشی | : | توخم‌و رەگەزی |
| کەت بکەت | : | یەك بەیەك |

# کامەران موکری

## ١٩٢٩ - ١٩٨٦

ناوی (محەمەد ئەحمەد تەها)یە، لە ساڵی ١٩٢٩ز لە شاری سلێمانی لە دایك بووە، خوێندنی تا پۆلی کۆتایی ئامادەیی بوو، بەلام لەبەر چەند هۆییێك تەواوی نەکردووە. لە نێوان ساڵانی ١٩٤٩- ١٩٦٣ز شەش ساڵ بەهۆی هەڵوێستی نیشتیمانپەروەرانەو نەتەوە خوازیەوە لە بەندیخانە دەست بە سەریدا ماوەتەوە.

ماوەیەکی زۆریش لەبەشی کوردی زانکۆی سلێمانی و(پاشتر سەلاحەدین) مامۆستای ئەدەبیاتی کوردی بووە، تا ٧ /١٢/ ١٩٨٦ لەشاری هەولێر کۆچی دوایی کردو گیانی پاکی بەخاکی پیرۆزی کوردستان سپارد.

تا لە ژیان دابوو حەفت دیوانە شیعری چاپکراوە، لەنێوان ساڵانی ١٩٥٤- ١٩٧١ ز دیارترینیان دیوانەکانی (ئاشتی) و (دیاری) و (ئاگرو ژیلە) و (گوڵاڵە سوورە)ن، دوای مردنیشی، لەساڵی ١٩٨٧ ز سەر جەمی شیعرەکانی بەناوی دیوانی(کامەران موکری) چاپکرا. سەرەڕای شاعیریەتی، کامەران موکری چیرۆك نووسیش بوو.

### مەبەستەکانی شیعری کامەران:

ئەگەر شیعرو هۆنراوەکانی موکری بخوێنینەوە دەبینین چەند مەبەستێککیان تێدایە کەگرنگترینیان ئەمانەن:

**١- نەتەوەیی و مرۆڤینی:** بەشێکی زۆری هۆنراوەکانی موکری هۆنراوەی نەتەوەیین، دیارە شاعیر، بەوهەستە ناسکەی کەهەیەتی وەك مرۆڤێکی نەتەوە خواز هەڵوێست لەبەرامبەر چەوساندنەوەی نەتەوەکەیدا وەردەگرێت، کۆمەڵێك هۆنراوەی هەن کەنموونەی بەرزی هەستی نەتەوایەتییان تێدابەدی

دەکرێت و ئەمەمان بۆدەردەخەن کەموکری شاگردو قوتابی، قوتابخانەی پیرۆزی کوردایەتییەو وەك شاعیرێکی ڕیالیزمی شۆڕشگێڕانەی نەتەوەیی خۆنیشان دەداو ژیانیش لایئەو هەرتێکۆشان وخەباتە لەڕێی کوردستان:

**١- ژین لەلای دڵسۆز هەرتێکۆشانە**
**هەوڵە بۆخاکی ئەم کوردستانە**
**٢- خۆزگە ئەندازەی ژیان و تەمەن**
**تێکۆشان بوایە بۆخلکی وەتەن**
**٣- ئاخۆ تەمەنی کام دڵسۆزی کورد**
**لەچوار پێنج ساڵێ، تێپەڕی ئەکرد ؟!**

(هەمووی بۆلەبەر کردنە)

لە تەوەرەیەکی تریش داو تەریب بە تەوەرەی کوردایەتی و هەستی نەتەوەییەوە،کامەرانی شاعیر، دڵسۆزو ئەمەکدار بووە بەرامبەر بە مرۆڤایەتیو، دەربڕی ناخی مرۆڤی کورد بووە، لەم لایەنەوە، هەر بۆیەش بووە کە خەباتی گەلی جەزایری لە دژی داگیرکەری فەرەنسایی بە خەباتێکی ڕەوا داناوە لێرەوە دنگی شۆڕشگێڕانەی مرۆڤی کوردی داوەتەپاڵ خەباتی ئەو گەلەو لە پارچە هۆنراوەی (ئەی جەمیلە) ئەم هەستە پیرۆزەی دەربڕیوە.

**١- ئەی جەمیلە.....**
**سلاو لە ئاگرو ژیلە**
**٢- لە حەیرانا ، لە لاوکا**
**کاتێ کچ لەگەڵ باوکا**
**٣- هەڵمەت ئەبەن بەرەو مردن**
**بەرەو قەلای سەختی دوژمن**

٤- له هێرشی ســەرکەوتنــا
له کاتی بۆ گەل, مردنـــا
٥- کاتێ لەنزار، لەمەڵبــەن
ئەمانسووتێنن بۆوەتــەن
٦- ناوت وەکو وشەی نەمــر
ئەرژێتە ناو گەرووی ئاگر
٧- ئەی جــەمیلـــە ......
سلاو لەئاگــرو ژیلـــە

(هەمووی بۆلەبەر کردنە)

**٢- خۆشەویستی و ئەڤینی:** مەبەستێکی تری شیعرەکانی کامەران، دلداری و ئەڤینی یە، دیارە ئەم هەستەش هەستێکی مرۆڤینییەو لـە دەروونێکـی پـڕ سـۆزو ناسـکەوە سـەر هەڵـدەدات و نموونـەی بـەرزی هەسـتی مرۆڤایـەتی دەنوێنێت :

١- کە پرچت ئالآن له گــەردن
گرت بەردا لــه دڵــی مــن
٢- کە پەرچەمت ڕشتە سەر ڕوو
ئاگر له دەرونــم بەربــوو
٣- ئەی زۆرداری جوانی بچووك
تکایە کچی ئێسك ســووك
٤- لێرەوە مەیە شەیدامــۆت
وەبالی دڵم بە ئەستــۆت

(هەمووی بۆلەبەرکردنە)

**٣- وەسفکردن:** ئەم مەبەستەش یەکێکە لە مەبەستە گرنگەکانی شیعری موکری. کامەران هەستێکی بەهێزی بەرامبەر جوانی سروشت و دەوروبەر هەبووە، یەکێکە لەو شاعیرانەی کە جوانی سروشتی ولاتەکەی خۆیان دەپەرستن، لەم لایەنەوە زیاتر بە لای شاعیرە کلاسیزمەکاندا دەچێت، زۆر جاری وا بووە جوانی سروشتی تێکەڵ بە جوانی ئافرەت و کچی کورد کردووەو تابلۆیەکی هەرە جوانی لە واتاو بەکارهێنانی پەیڤ و وشەدا بەکارهێناوە، هەستی ناسکی شاعیر وای دەکرد کە هەر دیمەنێکی جوان، جۆرە هەڵوێستێکی لەلا دروست بکات، تەماشاکە چۆن وەسفی (گوند=دێ) دەکات:

**١- کەژو دارستانی کپی**
**پۆشیویانە بەرگی سپی**
**٢- قوبەی پیرۆزەیی ئاسمان**
**بە پرشنگی گزنگی ئاڵ**
**٣- داوێنی کەژی ئەنەخشان**
**وەك ئەگریجە ئەبوو پەخشان**
**٤- دێیەك، لەباوەشی کەژا**
**بزەی گەرمی لێ ئەرژا.**

(هەمووی بۆلەبەرکردنە)

## ڕووخساری شیعرەکانی:

١. **بەکارهێنانی کێشی خۆماڵی (پەنجە)**: کامەران یەکێك بوو لەوشاعیرانەی کەبەرگی تازەگەرییەتی کردەوە بەر بالآی شیعری کوردییەوە، پەنای بردە بەرکێشی ڕەسەنی خۆماڵی و خۆی ڕزگارکرد لەکۆت وداوی (عەروز)ی عەرەبی، بۆیە شیعرەکانی مۆسیقاییێکی کوردانەیان تێدایە و لەگەڵ هەست وئارەزووی مرۆڤی کورد دەگونجێن، نموونە شیعرییەکانی پێشوو، کەهێنامانەوە ڕاستی ئەم بۆچوونە دەردەخەن.

٢. **کەم بەکارهێنانی وشەی بێگانە**: لەم لایەنەشەوە کامەرانی شاعیر بەرابەر دادەنرێت، تاپێی کراوە خۆی لەبەکار هێنانی وشەی بێگانە دوورخستووەو، لەجیاتی ئەوان وشەو پەیڤی ڕەسەنی کوردی بەکارهێناوە،وەکو مەلەوانێکی بەتوانا لەدەریای زمانی کوردی دا مەلەی کردووە. خوێندنەوەی نموونەکانی پێشوو ئەم ڕاستییە دەچەسپێنن.

٣. **خۆنەبەستنەوە بەسەرواى (قافیەی)یەککگرتوو بەکارهێنانی جووت جووت قافیە**: ئەم دیاردەیەش یەکێکە لەسیماجیا کەرەوەکانی شیعری کامەران موکریو لایەنێکی تازەگەریش پیشان دەدات، کامەران هیچ کاتێك خۆی بەکۆتی سەروا(قافیە)ی یەککگرتوو کۆت نەکردووەو واتای بەقوربانی سەروانەکردوە، بۆنموونە لەم چەند دێرە شیعرەی خوارەوەدا هەردوونیوە دێڕ، یەك سەروایان هەیە، واتە جووت جووت سەروای بەکارهێناوە.

**١- ڕوومەتی وەك گوڵی بێگەرد**
**قژی خاو، ئاوریشمی زەرد**
**٢- چاوی کاڵ، ئەگەر چی نەرمە**
**بەلآم نیگای ئێجگار گەرمە**

**٣- بالاّی وا، دەمێکی واتەنگ**

**ئەندامی ئاوا شۆخ و شەنگ**

**٤- نەبووە، یامن نەم دیوە هەر**

**لەو چەشنە بەژن ، یاکەمەر**

(هەمووی بۆلەبەرکردنە)

## لێکدانەوەی وشەکان :

| | | |
|---|---|---|
| ئەندازە | : | پێوانە ، پێڤانە. |
| ئاخۆ | : | داخوا ، داخۆ. |
| تەمەن | : | ژی ،عەمر. |
| تێپەڕی ئەکرد | : | زیاتر دەبوو ،لێی ڕەت دەبوو. |
| ژیلە | : | ژیلەمۆ ،زیلەمۆ. |
| هەلّمەت ئەبەن | : | هێرشدەکەن ،پەلامار دەدەن. |
| بەرەومردن | : | بەرەڤـ مردن. |
| بۆگەل ،مردنا | : | مردن لەپێناوی میللەت دا، |
| نزار | : | نسار ،شوێنێکە لەشاخ کەزیاتر بەرسێبەر بێت |
| ئەمانسووتێنن | : | مەدسۆژن، ئاگری لمە بەرددەن. |
| ئالاّن | : | ئالاّندن = تیّ ئالاّندن |
| گەردن | : | هەوك ،ئەوك = گەردەن |
| ڕشتە سەر ڕوو | : | بەردایە سەر دەم و چاوت. |
| دەروون | : | هەناو ، هناڤـ |
| ئیسك سووك | : | هستی سڤك. |
| وەبالّ | : | ئۆبالّ :گوناهـ |

ئەستۆ : مل ،ستۆ

بێگەرد : پاك ،خاوێن

قژی خاو : پرچی کراوە

ئاوریشم : حەریر ،ئارمیش

نیگای : ڕوانینی ،تەماشاکردنی

# مەلا مەحموودێ بایەزیدی

ل سالا۱۷۹۹ ل باژێری بایەزیدێ ژدایك بوویە، ڕەوشا سیاسیا بایەزیدێ ل نیڤا ئێکی ژسەدێ نۆزدێ یاباش نەبوو ژبەرجهێ وێ کۆ دکەفتە نێزیکی سنووریێ (ڕوسی– عوسمانی)، هەڤڕکییا دناڤبەرا هەردوو ئالییان دا کارتێ کرنەکا نەرێتی (سلبی) ل سەر ژیانا بایەزیدی یا جڤاکی و ئابووری هەبوو. مەلا مەحموودێ بایەزیدی ل زارۆکینیا خوە چووناڤ ڕێزێن قوتابیێن مزگەفتاو زانستێن ئیسلامی بایەزیدێ خواندن وبڕوانامامەلایەتێی وەرگرت. پاشی سەرەدانا وەلاتێ ئێرانێ کرول باژێڕێ تەبرێزێ ئاکنجی بوو، ل وێرێ خاند هەتا فێری فارسیێ بوویو شارەزاییەکا باش دزانستێن ئەدەبی و دیرۆکی و فەلسەفیو مەنتقیدا پەیداکر، جارەکا دن ڤەگەڕ یاڤە باژێڕێ بایەزیدێ، پاشی بەرەڤ ئەرزەڕۆمێ چوو ول وێرێ ئاکنجی بوو،لێدیار نەبوویە کاهەتا مرنێ ل ویرێ مایە یان بەرەڤ بجهەکێ دن چوویە هەڤالینی یەکا باش دناڤبەراوی و قونسلێ روسی (ئەلکساندەر ژاپا)ی داپەیدابوو کۆکوردی باش دزانی, ژاپای زۆر مفاژ هەڤالینیا خۆدگەل بایەزیدی وەرگرتییەو بایەزیدی زۆر هاریکاریاوی کریە یەکۆ چەندین دەستخەتان ب دەست خۆڤە بینیت و زۆرجاران ئەگەر نەشیابا دەستخەتی بخۆ بۆ پەیدا بکەن دابۆ فۆتۆ کۆپی کەت . ژاپای گەلەك جارا دگۆت مللەتێ کورد قەرداریێ مەلا مەحموودێ بایەزیدییە ژبەر کۆگەلەك لایەنێن ڕۆشنبیری پاراستینە.

## ڕۆشنبیریا بایەزیدی:

شارەزاییەکا باش دزانستێن شەریعەتێدا هەبوو، چەندین کەسا ل بەر دەستێ وی خاندییە. زمانێن کوردی،فارسی، عەرەبی، تورکی باش دزانی و کارتێکرن ل سەر بەفرەهبوونا ڕۆشنبیری و ڕووناکبیریا وی هەبوو ژبەرکۆ

ئەدەبێ وان گەلأن دخواندو مفاژێ وەردگرن. شارەزاید دیرۆکێدا هەبوو. وەرگێرەکێ خودان شیان بوو، چەندین بەرهەمێ فارسیو تورکی وەرگێراینە ل سەر زمانێ کوردی، هندەك جارا ناسناڤێ (فەقێ مەحموودئەفەندی)یان (خواجە مەحموودبایەزیدی) ب کاردئینا، لێ دناڤ کوردا داب ناسناڤێ مەلا مەحموودێ بایەزیدێ ناڤدارە.

## بەرهەمێن بایەزیدی:

١- کتاب عادات وتقالیدی ئەکراد: ل دۆر عادات و تەقالیدێن کوردایە وەك شەهیانێن وان، ئاشتیو شەرێن وان، دەست پێك ژی دەربارەی ئەسڵی کورداو زمانێ وادەو وەلأتیێوانە.

م.رۆدینکۆ وەرگیرایە سەر زمانێ رووسی و ل سالا ١٩٦٣ ێ ل مۆسکۆ بەلاڤکریە،

دکتۆرە شوکریە رەسولێ وەرگێرایە سەرشێوێ (کرمانجی خواروو) ل سالا ١٩٨٢ ێ لەبەغدا چاپکریە.

٢- تحفه الخلان فی لسان الکرد: دەربارەی رێزمانی زمانی کوردیە (تا نهۆژێ دەستنڤیسە ل پەرتووکخانا(سالیکۆف شیدرن) ل (پترو سبورگ ل رووسیا) هاتیە پاراستن.

٣- وەرگێرانا بەشێ ئێکی ژپەرتووکا (شەرەفنامە) ژ فارسی بۆ کوردی، کو ل سالا ١٨٥٨ ێ ز وەرگێرایە (ئەمیش هەر دەستنووسەو لە پتروسبورگ لەپەرتووکخانەی سالیکۆڤ شیدرن پارێزراوە).

٤- تاریخا نوو یا کوردستانێ ١٨٥٧ ز.

٥- رسالة في بعض الفروق الموجودة بين اللهجات الكردية وبيات بعض القواعد اللازمة واته: نامەیەك دەربارەی هەندێ جیاوازی نێوان زارە کوردییەکان و پیشاندانی هەندێ رێسای پێویست (پەرتوکخانا سالیکۆف شیدرن ل پترۆسبورگ)

دکتۆر مارف خەزنەداری ل سالا ١٩٨٤ ێ دپەرتوکا خۆدا (دەربارەی مێژووی ئەدەبی کوردی )دا بەلاڤ کریە.

٦- قاموسەکا بەراورد کرنێ دنافبەینا زارێن هەکاری و ڕەوەندی دگەل زمانێ فرەنسی دگەل ژاپای . دکتۆر مارف دکتێبا خۆ یا ناڤبری بەلاڤکریە.

٧- چیرۆکا مەم و زینێ ب دیالیکتا کرمانجیا ژووری ل ١٨٥٦ز ژاپای ئێخستییە سەر ئەلف و بێیا لاتینی و وەرگێڕایە ل سەر زمانێ فرەنسی.

٨- چیرۆکا (لەیلو مەجنون) ل سالا ١٨٥٨ز نڤیسییەو ژ لایێ ژاپای ڤە ئێخستییە سەر ئەلفو بێیا لاتینیو وەرگێڕایە ل سەر زمانێ فرەنسی.

٩- جامع یێ سالیانو حکایەتان، چل چیرۆکی کوردییە، کە دەبێتە یەکەمین کۆمەڵە چیرۆك لە مێژووی ئەدەبیاتی کوردی دا ژاپا کردوویەتی بە فرەنسی.

هەروەها چەندین چیرۆکێن دن نڤیسینە وەکو (یوسفو زولێخا)و داستانی (قەلای دمدم)و گەلێك بەرهەمی تر کە ژمارەیان دەگاتە بیستو شەش بەرهەم.

تێبینی : تا ئێستا دیارنەبوویە کە لە چ سالەکی دا چوویە بەر دلۆڤانیا خودێ، هندەك دبێژن ل (١٨٦٠)و هندەك کتێب ژی دبێژن ل سالا(١٨٦٧).

# پارچەك ژ چیرۆكا مەم و زینێ

میر زەینەدین نێزیکی ئیڤارێ ژ نێچیرێ زڤڕی، وها ڕاست هاتە باغێ، ل بەر دەرێ وێ قەسرا مەعلووم ژ هەسپی پەیابوو، ل ڤڕ شەربەتو قاوەیەکێ بخۆنو دگەل غولام و ئولداشێد خووە وها ژ نشکێڤە هاتنە دەرێ قەسرێ کۆ مەم و زین تێدا بوون، زین وێ وەقتی کۆ دەنگێ برایێ خوە بیهیست هۆش هاتە سەریو گۆت مەمۆ چە دبێژیو چەدکەی؟ ئەڤە میرهات؟ کۆ ئەڤـــ خەبەرا گۆت، ئێدی ناچاری، مەم زین ئەستاندە بنێ عەبا خوەو ڤەشارتول گۆشەیەکی قەسرێ قەلبەخیو ڕوینشت دنێڤ دوو بالگیاندا وها ب وێ حالێ، میر دگەل قەرەبالغا خوە هاتە هندرێ قەسرێو دیت کۆ مەم خوە ل عەبایێ پێچایە ل گۆشەیەکی ڕونیشتییە. میر سلاڤــ داژی، مەم سلاڤــ ئەستاند ئەمما قەت ژ جهێ خوە نەبزافت، میرم معزور بدیرین ئەڤــ بەنی نەخۆشم هاتمە ڤڕاو من تاگرت قەت مەجالا لپاتو حەرەکەتی نادیرم ل ڤرا وهام مام. میر گۆت کۆزەرەر نینە ل کەیفا خوە نێڕن. میر روینشت وەرکەسەك جێ بەجێ روینشتن، دیوانخانە تژی بوو. میر شەربەتو قەهوە ئەمر کر، ئیشەڤـ ل ڤرا کەیفێ بکن.

ژهەر تەرەفەکی دەست ب کەلامو خەبەردانێ کرن، مەجلیس کەملیو گەرم بوو. تاجدین دوێ مەجلیسێدا حازر بوو، ل حالێ مەمۆ نێڕێ، زانی کو ژ ئەحوالەکی عەجیبە. خالی نینە کو مەم وەها نوقمێ بەحرا غەمان بوویە، تاجدین ڕابوو هاتە نێزێکی مەمۆ و ب ئیشارەت ئەحوالێ وی ژێ پرسیار کر، مەم ژی دوو کەزی ژ پۆرێد زینێ ژ هۆ چکا عەبایی ب خف دەرئانی و نیشانی تاجدینیدا.

(لە سەرە تاوە لە (میر زێنەدین نێزیکی ئێڤارێ ) بۆ لەبەرکردنە تا (ئەمما قەت ژ جهێ خوە نەبزاڤت).

| پەیڤ | رامان |
| --- | --- |
| خەف | : نهێنی = بەدزیەوە |
| هۆچك | : قۆڵ |
| لپات | : جولانەوە |
| کرن | : جار |
| بەنی | : کوهر : کۆیلە : کولەدار |
| هێسای | : راحەت : حەسانەوە |
| پەیا بوو | : دابەزی |
| لەڤر | : لێرە |
| ئەستاندە | : ستاندی یە : خستیە |
| ڤەشارت | : شاردەوە |
| هندرِ | : ناوەندی ، ژوورەوە |
| سلاڤـ ئەستاند | : سلاڤـ ستاند، سلاڤـ وەرگرت |
| نەبزاڤت | : نەجولایەوە |
| نێڕی | : سەیری کرد– تەماشە کرد |
| خالّی نی نە | : والا نیە |
| کەزی | : گێسو |
| پۆر | : پرچ |
| بالگی | :بالگۆك :سەرین :بالیفك |
| ڕەوشا سیاسی | :باری سیاسی، ڕەوشی سیاسی |
| نیڤائێکێ | :نیوەی یەکەمی |
| هەڤرِکی | :رِکابەری |

هەردووئالییان دا :هەردوولایاندا

جڤاکی :کۆمەلأیەتی

لــ زارۆکینیاخوە :لەوکاتەی کەزارۆ (مندالْ) بووە

ڤەگەڕیا :گەڕایەوە

بەرەف : بەرەو

مفا : سوود, قازانج :فایدە

بەرفرەھ بوونا : فراوان بوونی

خودان شیانبوو : بەتوانابوو :خاوەنی شیانوتوانابوو

ژ نێچیرێ زڤڕی :لەڕاو گەڕایەوە

هاتەباغیْ :هاتەناوباغ

لــ هەسپی پەیابوو :لەئەسپی پیادەبوو :واتادابەزی

ئۆلْداشێدخوە :وەلداشەکانی(هەڤاڵەکانی)خۆی

ژنشکێڤە :لەناکاو :لەپڕ

هۆش هاتەسەری :هاتەوە هۆش خۆی :بەئاگاهاتەوە

ڤەشارت :شاردیەوە

دگەل قەرەبالغاخوە :لەگەلْ ئەوخەلْکە زۆرەی کەلەگەلْی بوون

هاتە هندریْ قەسریْ :هاتە ناوقەسر

قەلبەخی :سەکنی, مات بوو

تژیبوو :پڕبوو

ئیشەڤــ :ئەم شەو

# میر جەلادەت بەدرخان

ئەم زانا مەزنە کە سەر بە بنەماڵەی کوردپەروەری بەدرخانیانە یەکێکە لە گەورەترین و بەناوبانگترین کەسایەتییە کوردییەکان کە لە بواری نەتەوەیی و ڕۆشنبیریی کوردیدا کاری کردووە لە نیوەی یەکەمی سەدەی بیستەمدا، میر جەلادەت لە ساڵی ١٨٩٣ لە ئەستەمبوول لەدایك بووە[1] ، کوڕی میر ئەمین عالی بەدرخان بوو، خوێندنی سەرەتایی و دواناوەندی لە شارەکانی ئەستەنبوول و ئەنقەرە و سالۆنیك و ئەدرنا تەواو کردووە، لە ساڵی ١٩١٩ لەگەڵ (مێجەر نۆئێل)ی ئینگلیز دا سەردانی کوردستانیان کردووە بەمەبەستی ڕێکخستن و بەرپاکردنی شۆڕشێك لە دژی کەمالییەکان لە تورکیا، بەڵام ئەم هەوڵەیان سەری نەگرت، کاتێکیش جولانەوی کەمالییەکان پەرەی سەند و دەسەڵاتیان لە وڵاتی تورکیا گرتە دەست، فەرمانی لەسێدارەدانیان بۆ میر جەلادەت و باوکی و براکانی دەرکرد، لەبەرئەوە ناچاربوو پەنا بباتە بەر وڵاتی ئەڵمانیا، کە لەوێدا درێژەی بە خوێندن دا و لە بواری یاسادا خوێندنی تەواو کرد. لە ساڵی ١٩٣٢ لە شاری دیمەشق گۆڤاری (هاوار) و لەپاشان گۆڤاری (ڕۆناهی) بە زمانی کوردی دەرکرد، میر جەلادەت بەدرخان بەوە بەناوبانگە کە ئەلفبای کوردی بەپیتی لاتینی داناوە و، بیرۆکەی ئەو ئەلفبایەی لە ساڵی ١٩١٩ دا لەلا پەیدا بووە، سەرەتا توانی ئەلفبایەك دابنێ کە ژمارەی پیتەکانی ٣٦ پیت بوون، پاشان لە ساڵی ١٩٢٤ کە لە ئەڵمانیا بوو بەو ئەلفبایەدا چووەوە و دەستکارییەکی تیادا کرد و ژمارەی پیتەکانی کردن بە ٣٤ پیت، تا لە ساڵی ١٩٢٨ بۆ جاری دووەم دەستکاری تیادا کرد و ژمارەی پیتەکانی کردن بە ٢٥ پیتی لاتینی. ئەم

---

[1] لە هەندێ سەرچاوەدا ساڵی لەدایکبوونەکەی بە ١٨٩٤ و لە هەندێکی تریشدا بە ١٨٩٧ دانراوە.

ئەلفبایە بووە بنەما بۆ ئەلفباکەی کە لە ۱۹۳۲ دا لەسەر لاپەڕەکانی گۆڤاری هاوار بڵاوی کردەوە. ئەم زانا مەزنە لە ۱۵ ی تەمووزی ۱۹۵۱ کۆچی دوایی کرد.

(سەرچاوە پەرتووکی الألفباء الكوردية)

داناني هۆگر طاهر توفيق

**ئەمەش نموونەیەکە لە نووسینەکانی:**

## ڕەشبەڵەك

(ژ جەمشید و سینەم خانێ وە ل

بێروتێ، مێڤانێن مامێ خووە)

**زارۆ نۆ!**

ئەڤ بوونە دەھ پازدەھ رۆژ وە تەرکا مالا باڤێ خوە داو ھۆن چوونە بێروتێ، نك مامێ خووە، باوەڕ بکن ئیدی وەختا کۆ ئەم لسەر ڤێ چوونێ ھەنەك خەبەر بدن، بڤێ نەڤێ ھۆن ژ ھۆنێ بخوازن بزانن دپەی وەرە و پەیی وەبەر گەھێ.

مالا باوێ وە چەوان دخویا بە وە د پر گارا مالا وەدە ھاتییە گوھەرتن و ئەڤ چاوان گۆھێڕیە و ب ڤێ گوھارتنێ گەلۆ ئەم رازینە، ئان ئەم بیریا وەختێ بەرێ، وەختێ کو ھۆن ل مال بودن دکن ھۆن ب خووە ژی دزانن کۆ ئیشێ وە زەھمەتە، تەشغەلەکە.

(ھەمووی بۆ لەبەرکردنە)

## لێکدانەوە وشەکان:

| | |
|---|---|
| ڕەشبەڵەک: | لە ناوچەی بۆتان بە نامە، یان، گاغەز دەڵێن. |
| ژ: | بۆ |
| مێڤان: | میوان |
| زارۆک: | منداڵ |
| زارۆنۆ: | منداڵینە |
| مالا باڤێ خووە: | ماڵی باوکی خۆی |
| هۆن: | ئێوە |
| نك: | کن ، لە ، جەم |
| ئیدی: | ئیتر |
| ئەم: | ئێمە |
| هەنەك: | هەندێك |
| خەبەر بدن: | قسە بکەین |
| بڤێ نەڤێ: | بتانەوێت یان نەتانەوێت |
| دی پەی وەرە: | لەپاش ئێوە |
| بەرگەهی: | بەردەرگا |
| دخویا: | دەردەکەوێ، دیارە |
| پڕگار: | حەوشە |
| گوهەرتن: | گۆڕان |
| کەلۆ: | کوڕینە |
| بیریا: | بیری |

# بابەتەکانی بەشی خوێندنەوە

## لاوکێ دەروێشی عەڤدی

دەروێشێ عەڤدی لاوەکی ژێهاتی و بەرکەڤتی بوو، ژ ئویجا خەکا ئێزدیا بناڤــو دەنگ بوو.

ناڤــو دەنگێ شۆخو شەنگیا(عەدلە خان) کچا (زۆر تەمەرپاشای مللی) گوه لّی دبیت، مالّو کەسو کارێن خۆ دهێلیت، دچیت و دبیتە قەهوەچییێ کۆچکا (زوۆ تەمر پاشاییێ مللی) ژبۆ مەرەما خاستنا عەدلە خانی.

دوی دەمیدا ئێك ژحاکمێن وی وەلاتی لەشکرێ خوە دهنێریتە سەر (زۆر تەمەر پاشا) ی باج و دراڤێن سالەکێ ژێ دخوازیت، ئەو ژی کورو برازاو زەلامێن خۆ کۆدکەتو پرسیاروان دکەت، کا باجو دراڤی بدەن یان شەڕی بکەن؟ هەمی دبێژن: ئەم نەشێین شەڕی بکەین دێ باجیّو دراڤی دەین.

دەروێشێ عەڤدی ڕابوو سەرخۆو گۆت : ئەم چ تشتی نادەینو دێ شەڕی کەین. چوو مەیدانیّو سواران دەست دا چەکیو دگەلدا شەڕێ لەشکرێ وی حاکمی کرو شکاندو بسەرکەڤتن. عەدلە خانێ مێرانیا دەروێشێ عەڤدێ دیتو، چوو دلی حەژێ کر.

بابێ وی ژی ژبەر مێرخاسیا وی کرە ئێك ژ سیارێن خۆ.

هندە بسەرڤە نەچوو ناڤو دەنگێ ئەڤینیو حەژێك کرنا عەدلە خانێو دەروێشێ عەڤدی کەڤتە دەڤێ خەلکی . براو پسمامێن عەدلە خانێ زانیو چوونە نك بابێ وی گۆتێ :

((دەروێشێ عەڤدێ))وێ لدویڤ نامووسا مە دگەڕت[1] ئەڤینیا ویو عەدلە خانێ بۆ گۆتن. مەدڤێ تو دەستویرا مەبدی حەتا ئەم وی بکوژین

---

[1] دەڤەکان بە شێوەزاری پاڵەوانانی چیرۆکەکەنووسراون.

بابێ عەدلەخانێ دەستویرا وان دا، بە لێ وان دخۆرا نەددیت کو بشێن بکوژن چونکی گەلەکێ مێرخاس‌و عەگیدو ئازابوو، لەوا تەگبیرا خۆکر کوب فێلێ بکوژن، دگەل خۆ ببنە نێچیرێ‌و لە دەمێ خارنێ کۆدێ چەکێ خۆ دانیت پێکڤە داننێ.

((عەدلە خانێ)) ب هندێ زانی و گەهاندە ((دەروێشێ عەڤدی)) بەلێ مخابن گوهێ خۆ نەدایێ چونکی یێ ژ خۆرازی بوو، باوەڕ نەدکر کودێ کەس شێتێ. ڕادبن خوارنا هەفتەیە کێ بەرهەڤدکەن، هەمی پێکڤە سیاردبن دچنە ((چەمێ گرزوونێ)) بۆ نێچیرێ کۆ ئەڤ چەمە یێ کویرو بسەهمە ل دەمێ دەروێشێ عدڤدی یێ ب خوارنێڤە مژویل و چەکێ خۆ دانای... هەمیا پێکڤە هێرش برە سەرو کوشت‌و لەشێ وی هاڤێتە ناڤا چەمی و زڤڕینەڤە.

((عەدلە خان)) هەڕۆ دچوو سەربانێ کۆچکا بابێ خۆو بەرێ وێ ل ڕێێ بوو کادێ کەنگی نێچیرڤان زڤڕنەڤە گەلەک دترسانە کۆ((دەروێشی عەڤدی)) نەزڤڕیتەڤە. دەمێ نێچیرڤان زڤڕینەڤەو((عەدلە خان))ێ دیتی ((دەروێشێ عەڤدی)) دگەل نینە، دلێ وێ لێدراو جەرگێ وێ سۆت، ئەڤینا خۆ دیارکرو ئەڤ لاوکا ب خۆو دەروێشێ عەڤدێ گۆت:

((دەروێشێ عەڤدی)) دگۆ:

من نەڤێ مالەکی تێری تژی، من دڤێ ئەوەل دین‌و ئیمان، ژنەکی جوان، ماهینەکی ب بەرز تاژییەکێ بکوژ، کۆنەکی ڕەش حەلەبی، مێکوتەکی ل داری داربناڤێ. ئەزێ ڕابم بەری کۆنی بدمە چیایی ((قەرەچ داغێ)) پشتا کۆنی بدمە تیرێژا تاڤێ.

((عەدلێ)) دگۆ:

ئـەزێ ڕابم سـینگێ خـۆ بکەمـە سـێنی، ڕابم خـوە ب گـولاڤێ بڕەشـینم میسالا گولان و گولبەندان، بچم پێش کـوڕە دەروێـشێ عەڤـدی هاتڤـە لگـەل سەلەفەکی عەگیدانو مێرخاسان، ئەزێ ڕابم جەلەبا ماهینـا کـوڕە دەروێـشی خۆ بکرم،

((عەدلێ دگۆ))

لێ من دڤێ قومەکی ئـاڤێ ژ ئاڤـا‌ــ فـەریتو. ئـەزێ ڕابم هنگـێ دەسـتێ خوە ژ دەرویشێ عەڤـدی هـل گـرم، حـەتا وێ ڕۆژێ یـا (زۆر تـەمـەر پاشـایێ مللی) دادنێ دارەکێ ل داری د جەلێتۆ ...

((عەدلێ دگۆ))

ئەز نە ب مالم نەب مێـرم، بـەرێ خودانـا حـەفت بـراو دوازدە پـسمامێن وەکـو شـێرم. ئـەز ڕۆژێ سـێ جـاران کـوڕە دەروێـشێ خـۆ نـەبینم ل گـەڕێ دیلانێ، ل حاویا گۆڤەندێ، ل حوویا شاهێی مەیتێ هەر حـەفت بـرا و دوازدە پسمامان ل زیارەتێ بەرێ مالێ ب دەستێ خۆ ڤەشێرم.

((عەدلێ دگۆ))

منێ نە ((کیکیمە)) نـە ((ملیمـە)) کـچکا((زۆر تـەمـەر پاشـایێ))مللیمـە، دەزگرا دەروێـشێ عەڤـدی مـە لـسەر چـیای((قـەرەچ داغـێ)) ڕۆنـشتیمە، ب کراسـەکی کتـانی((مەگرووميمـە))، ب سـۆلەکی زەری ڕەق ڕەقیمـە، کلـێ چـاڤێ((دەروێـشێ عەڤـدی))مـە، منـێ ڕۆژێ سـێ جـاران کـەرەم دکـەم

ب((دەروێـشێ عەڤـدی))، حاشـا دكـەم ل دینـێ ((موحەممـەدی))، سـاف ئەز((ئێزدی))مە ...

((عەدلێ دگۆ))

سەحەرا سپێدێ، كزە بایەكێ شەمالێ ساردێ، كچكێ هوین بـەعام ڕابـن بچینە سەرێ چیای ((قەرەچ داغێ)) زێهنا خۆ بدینە تیرا بنێ بەڕییێ ((دەشتا عۆگنێ)) وەكی تێتە حییلێنا سواران، چڕكێنا ڕكێبان، وەشینارمان، دەنگـێ ((گورزەمیسرییان))، شەقەشەقا ئەنگوستیلا ((دەروێشی عەڤدی)) لـسەردارا (ڕمێ)ل گوهینـامن چ خـۆش تـێ! ئـەزێ ڕابم نیڤـا شـەڤێ لگـەل (دەروێـشێ عەڤـدی) بكراسـەكی مەلـەزێ كتـانی (مـەگروومی) بـنڤم ل خیڤـەتێ... كـوڕۆ دەروێشۆ وێ گاڤێ دێ مرنێ مال و وێرانییێ ژبیركی...

((عەدلێ دگۆ:))

بەژنا (دەروێشێ عەڤدی) میسالا شـەنگە بیـەكێ دگەلیـدا، ئـەمان كـوڕۆ دەروێشۆ، تۆڕابە (تەمدەوانیەكێ) سپی لەسەرێ خۆگرێدە.

هەرگاڤەكێ ((دەروێشێ عەڤدی)) بێت ل گەل سەلەفەكی عەگیدانو عەدوان، یاژمن ڤە شێخەكی كامیلە، تەریق دارە، لەگەل مریدان.

كوڕۆ(دەروێشۆ) تۆسوار بە ل جانی ماهینەكا شینكێ كەزانی، ئەمان ل گەڕێ دیلانێ ل حاویا گۆڤەندێ،نەكە: تەڕاد و مەترود نـەدەغارێ، نـەكو ل شـینكێ (جەدەلانی) بكـەڤی خـوارێ، نـەكۆ خـەلك و عالـەما گونـدێ مەبێـژن:(عەدلـە خاتوون) عاشقا تۆینەكی نەی سوارە...

**عەدلێ دگۆ:**

سەرێ منێ گەلەکێ دێشی، دلێ منێ گەلەکێ ڕەقە، میسالا بزمارێ سەرێ پەرچە حەتەبێ سۆلا دەوارێ تەیە.

**عەدلێ دگۆ:**

ئەڤرۆ مالا (دەروێشی عەڤدی) لێدناو دچوو سەربەرەو خوارە، دچوو حاویا ((مەلامحەممەد)) چەمێ(گرزوونێ) جهێ شێران و پلنگان دەحل و داران، ئەزێ ڕابم چەهڤێ خوە ل سەر دارێ دووربینێ بینم‌و بشدینم، سەلەفەکی ژ سوارێن کیکان‌و مللییان بینم‌وبگەڕینم .ئەمان گەلەکی حەیفا من دمینی ئەڤرۆ کوڕە ((دەروێشی)) من ل ناڤ تیپەکێ سیاران نایێ‌و نەدیارە....

**عەدلێ دگۆ:**

داوەتەك دگەڕا لگەڕێ دیلانێ، حاویا گۆڤەندێ ،حوببا شاهیێ ئەزێ رابم گاڤەکێ بچمە دەستێ دەروێشێ عەڤدی خەلك و عالەمێ گوندێ مە بلا بێژن بەژنا ((عەدلێ)) چەند شیرین لگەل بەژنا ((دەروێشی))دێ.

**عەدلێ دگۆ:**

کوڕۆ دەروێشۆ.....تۆ وەرە ڕاموسە سەرێ ڕوومەتا سۆرا گولگولی خۆشترە ژتەمرا (بەغدایێ) ژترێ (باکور مانێ) ،ژهنارا ((شەقلاوە))یاکۆ بێ ناڤك وبێ بەرکە[1]

---

[1] بەدەستکاریڤە ژ کتێبا (کۆمەلێك لاوك‌وحەیران)کۆکردنەوەی مامۆستا محمدی مەلا کەریم وەرگیراوە .

| وشه | | مانا |
|---|---|---|
| چۆدلی وحەژیٚکر | : | عاشقی بوو |
| ئەڤینی | : | خۆشەویستی |
| پسمام | : | ئامۆزا |
| مەدڤێت | : | دەمانەوێت |
| دخوە ڕانەدیتن | : | نەیان توانی، لەخۆیان ڕانەدیت |
| ب ساناهی | : | بەئاسانی |
| ژبەر هەندیٚ | : | لەبەر ئەوە |
| نێچیر | : | ڕاو |
| مژویل | : | خەریك |
| تێری تژی | : | زۆرو پڕ |
| کۆن | : | ڕەشماڵ |
| دار ب ناڤـ | : | دارێکی زۆر جوانو ساغە لە داری ساج دەکا،دار بناو،داربناو |
| تاڤـ | : | هەتاو |
| گاڤەکی | : | نەختیٚ ،تاوێك |
| بسەکنم | : | ڕاوەستم |
| سەلەفەك | : | تاقمێك |
| ڕامووسان | : | ماچکردن |
| فەریتۆ | : | فوڕات |
| جەلیتۆ | : | جەلاد ،زەلام سەربڕ |
| گەڕا دیلانیٚ | : | کۆڕی شایی |

| | | |
|---|---|---|
| لحاويا گۆڤەندێ | : | لەمەیدانی هەڵ پەڕکێ |
| لحوبیا شاهیێ | : | لەناو گرمێنی شایی |
| مەیتێ | : | جەنازە |
| زیارە | : | قەبرستان ،گۆڕستان |
| کیکانو میللی | : | دووعەشیرەتی کوردن |

# بەنداڤا دوكان

بـۆ پێـشكەڤتنا وەلاتـی و گوهورینـا بـاریّ ئـابووری‌و گەشـەدانا جـۆرا چاندنیّ مل ب ملیّ پیشەسازی و بازرگانێڤە، گەلەك تشت یێن هەین ب هیڤیا حكومـەت‌و گەلیڤەنـە، ژوان: سـاناهیكرن و بەرهـەڤكرن و بجهینانـا ئاڤـــو ئاڤـدێریا وان دەڤـەران ئـەوێن چـاندن لێ دهێتـە كـرن‌و، هانـدان و هاریكاریـا خەلكی، نەخاسمە جووتیاران ژلایـیّ زانـستا چـاندن و ئاڤـدان و بەرهـەڤكرنا ماكینەو تۆڤـ و گەلەك تشتێن دی ڤە.

هەروەكی ئەم دزانین ئاڤدێری و ئاڤـدان شـادەمارا چـاندنێیەو دبیتـە ئەگـەرا پێشڤەچوون‌و چەند جاركرنا بەرهەمیّ زەڤی و زاران.

وەلاتیّ مە... گەلەك ڕوبیارو زیێێن پڕ ناڤـــ تێرا دبوورن، كۆ وەكی دەمارێن لەشیّ مرۆڤی زەڤی‌و زارێن كوردستانا خۆشتڤی تێر ئاڤـــو بەراڤـ دكەن.

كەڤندا جووتیارو ڕەزڤانێن مەلدیڤە پێڤە هاتنا خۆ جۆك و دەراڤك بۆ ئاڤدانیّ چێكرینە، بـەلێ ئـەو هـەمی ئاڤـا ڕوبیـارێن مـە شـۆردبیتە خـریّ و بەرەڤـــــ دەشتیّ دچیت و درژێتە دیجلێدا، ژبەر كـۆ هاڤینـان رویـیّ ئـاڤیّ نـزم دبیـت‌و جووتیار ل گەلەك جهان نەشێن ڤیّ ئاڤیّ بگەهێننـە زەڤیـێن خـۆ، زڤـستانان ژی ئاڤا زێدە دبوورین‌و مفای ژیّ وەرنـاگرن، ژبلـی كـۆ ترسـاهندیّ ژی هەیـە بازێرێن ناڤەڕاستا عیراقیّ بە تـایبەتی (بەغدا) ڤبەر لێڤانیّ (لەهیی) بكەڤن.

حكومەتیّ هزرا هندیّ كر بەنداڤەكی لسەر زێیا بچوویك دروست بكەت دا ئاڤـا زێدە بپەنگینیت‌و ل دەمـیّ پێـدڤیّ مفـای ژیّ وەربگریـت، ئەڤـــ هـزرە سـالا (١٩٥٤)یّ بجە هاتِ ول پشت چیایێن دەڤەرا (پیرە مـەگروون) ل جهـەكیّ كـۆ دبێژنیّ (دۆكان) بەنداڤەك ب ڤی ناڤی هاتـە دانـان گۆمـەكا مـەزن ژیّ چـێبوو

کۆنێزیکی (٦/٨ ملیار مێترێن سێجا) ژ ئاڤێ تێدا پەنگاندنو چەند دەرگەهەك بۆ چێکرن دا ئاڤا وێ کۆنترۆل بکەتو لدویڤ پێداڤیا خۆ بەردەتو بگریت.

بەنداڤا دۆکان، ژبلی ئاڤدانێو، پاراستنا بازێڕێ بەغداو بنێن دەشتان ژ لێڤانا دیجلەو، پەنگاندا ئاڤێ بۆ وەرزێ هاڤینێ، چەند مەفایەکێن دی ژی هەنە، وەکی: ئەڤ بەنداڤا یا بوویە سەیرانگەهەکا خۆش و، حوکمەتا هەرێما کوردستانێ لبەرا بکەتە ماکا بخودانکرا ماسییان، رێکا هاتنو چوونێو گەشت کرنا ب بەلەمانە. ئەڤە ژبلی کۆ ژێدەرەکا مەزنە بۆ کارەبایێ، ئەڤ بەنداڤە دگەل بەنداڤە زێیا سیروان ل دەڤەرا سلێمانیێ کۆ دبێژنێ دەربەندیخان هەوایێ وێ دەڤەرێ ل هاڤینێ خۆش و هێن دکەنو هەلما ئاڤێو شەهێ ل زڤستانێ پەیدا دکەن.

| ووشە | مانا |
| --- | --- |
| مل بە مل | شان بەشان |
| سانا | ئاسان ، ساناهی |
| بەرهەڤکرن | ئامادەکردن |
| لەهی | لەی ، لێفان ، لافاو |
| نەخاسمە | بەتایبەتی |
| تۆڤ | تۆو |
| ئەگەر | هۆ |
| تێڕابوورن | پێدا تێپەڕدەبن |
| تێڤە هاتن | دەستهەلات |
| بەرەڤ | بەرەو |

| | |
|---|---|
| پێدڤی | پێویست |
| لێفانه | لافاو |
| پەنگاندنێ | گلدانەوە ، پونگاندنەوە |
| مفا | سوود ، فایدە |
| دی ژی | دیش ، تریش – دیکە |
| لبەرە | نیازیەتی ، لەبەردایە |
| ماك | دایك |
| هین | فێنك |
| شە | شێ |

# دارستان و پاراستنا وان

دارستان ل کوردستانێ جهەکێ بەر فرەهـ ژ دۆلێو شیڤێن کوردستانێ ڤە دگریت و شینی و کەسکاتیا وان شەرێ دگەل ئاسمانێ ساهیێ و تەڕاتیا بهارێ دکەن، گەرچی ماوێ ڤان سیهـ چل سالێن بۆری هندە گرنگیو پیتە نەهاتیەدان ب دارستاناو ئەڤ دارستانە بەرەڤ سووتن و نەمان دچن، ئەگەر یاسایێ پارستانا نەهاتبا گۆڕێ، دارستانێن مەکۆ دپرن ژ دارو تراشێن بەردار یان بێ بەر، ژ بەڕوی و کەزان و هنار و گویز و مازی و کاژ و سەرو گەلەکێن دی، ئەڤ هەمی سامانێ وەلاتێ پێکدئینن ئەڤ دارستانە ژبلی جوانی گەلەک مفایێن خۆ هەنە، ئەگەر ب ئاوایەکێ باش ول پەی یاسایێ مفا ژێ بهێنە وەرگرتن. ژبلی ڤێ چەندێ دارستانێن مەجهێ حەواندنا بالنداو گیانەوەرێن کیڤینە، کو ئەو ژی پشکەکن ژ سامانێ لە هاڤینێدا وهۆیێ پاراستنا ئەردی یە ژ لەهیێن ئاڤا زڤستانێ و بەهارێ داکۆ بەتەنێن چیاو جهێن بلند ڕانەمالیت.

ئانکۆ دارستان ژ تشتێن باش وب مفایێن وەلاتییە ژ بەرکۆ ژبلی وان مفایێن هاتینە باسکرن دبنە هۆیێ جوانیو قەشەنگی یا وەلاتیێو جهێ دروست بوونا هاڤینگەهـ و سەیرانگەهایە:

وەلاتی ب ڕەنگەکێ وەسا پێویستی پێ هەیە کۆ نهۆ ل زۆر جهێن وێ حکومەت دەست ب دروستکرنو پەیداکرنا دارستانێن ب دەست چاندی دکەت هەروەکی هەتانهۆ ژێ کار دڤی بیاڤی دا دهێتە کرن.

ئانکۆ پێویستە ل سەر مەهەمیا بزاڤێ بکەین ژ بۆپاراستنو نەبرینا دارو تراشێن دارستانێن مەو خەلکی هاندەین ژ بۆچاندنا داروباران وەك خۆیایە دهەمی جیهانێ داو دوەلاتێ مەژی دا رۆژەك لەدەستپێکا بەهارێ هاتیە

تەرخان كرن ب ناڤێ (جەژنا داروبارا) د مەها نەورۆزێدا كوتێدا خەلك بهێتە هاندان بۆچاندنا داروبارا و پاراستنا وان ژ برِین و سۆتنێ پێتڤیە ب دل وجان هەمی تشتەكی وەلاتێ خۆ بپارێزین ژوان داروبار و دارستانێن مە ژبەر هەندێ دبینین حكومەتا هەرێما كوردستانێ زۆر پویتەی ب دارستانو پتر كرنا دارستانا د دەت هەتا كوبینە جهێ جوانیو خەملاندنا وەلاتی، و ئەڤەژی تنێ ئەركێ حكومەتی نینە بەلكی پیدڤییە هەڤوەلاتی ژی دگەل دام و دەزگەهێن حكومەتی د هەڤكاربن ژبۆ پاراستنا دارستانا و دروشمێ وان ببیتە (بچینەونەبرِە).

## فەرهەنگۆك

| پەیڤ | رامان |
|---|---|
| شیڤ | دۆڵ . شیو |
| ساهی | سامال |
| بویتە | گرنگی، بایەخ، ماتی پیٚكرن |
| تراش | دەوەن |
| مفا | سوود |
| هینكاتی | فێنكی |
| لەهی: | لێیی لافاو:لێفان |
| بیاڤ | بوار .مەجال |
| گرنگیو پیتە | گرنگیو بایەخ |
| ژبەرِویو كەزان | لەبەرِوو قەزوان |
| ل پەی یاسایێ | بەپێی یاسا |

| | |
|---|---|
| دروشمێ وان | نیشان و شیعاران |
| هەڤوەلاتی | هاو وڵاتی |
| ژبلی | جگە لە، بێجگە |
| ل پەی | بەپێی |

# نقيســـين

ئەم د پشت راستين ئەگەر نهۆ ئێك بێژيتە تە: (بێ زەحمەت وێ كتێبـێ بكە د وێ تەنويرێ دا بلاهشك ببيت وسۆر ببيت). دێ ب مەندە هۆشـی ڤـەلێ نێڕی، لێ نەكاكە گيان مەندە هۆش نەبە ، ژبەر كو بەری هزاران سالا نقيسين ب تيرۆژكێن ڕۆژێ و ئاگری هشك و سۆر دكرن .

بابليـاو ميـسرييا نقيـسينێن خـۆيێن تايبـەت هـەبوون، بۆهەرپەيڤـەكێ يـان ناڤەكی يـان مەرەمـەكێ يـان پيتـەكێ نيشانەيەك دانـابوو، كۆ نقيـسينا وان ژنقيسينا مەيا نهۆ زۆر گرانتر بوو ژبلی نەبوونا پێنڤيس و كاغەزا.

بابليا هەڕی دئينا وەكی قالبەكێ رێكوپێك د بـڕی وپاشـی ب تـشتەكێ سـەر تيژ چ ڤيابا دا ل سەر وی قالبی دنقيـسن، پاشـی ئەگـەر تيرۆژكـێن رۆژێ زۆر دگەرم بانە دا داننە بەر تاڤێ هەتا ئەو بخۆ هشك و سۆر دبوويان دتە نـويرێ دا جوان سۆر دكر، مێژوو نقيسان زۆر ژوان قالبان ڤە ديتينە كۆ هنـدەك ژوان پێشی دووهزار و پێنج سەد سالا ل سەر هاتينە نقيسين.

ئەگەر تشتەك ل جەم وان زۆرێ گرنگ باوەكی (ياسا)يان(ئـاينی) داب پارچـە كانزايەكی ل سەر كەڤرێن مەزن كۆلن.

وەك ياسايا (حەمورابی)يـێ فەرمانـدارێ بابليـا كۆبـەری٤٠٠٠ چـارهەزار سـالا دكەڤرەكی كۆلايـە، نهـۆژێ ئەگـەر لێ نێـری ئـەو نقيـسين ب باشـی ياديـارەو شارەزا ب سانەهی دشێن بخوينن: ميسرييا ياژی لەدەسـتپێكێ هـەر ل سـەر كەڤرا دنقيسی ، پشتی هينگی بەلگێن دارێن تايبەت كـۆل دۆلا (نيـل)دا شـين دبوون دئينان ول سەر دنقيسين.ميسری دڤی بياڤی دا زۆر دهۆسـتا وشـارەزا بوون، ب خامێن قاميشی ومەڕەكەبی (حبر) ل سەروان بەلگا دنقيسی يۆنانی ژی ژميسرييان فێری نقيسينێ بوونو لسەرڤان بەلگا دنقيسی دەمـێ عـەرەب

ل سەردەما ئیسلامیێ چووینە میسریێ ئیدی نڤیسین، ل سەروان بەلگا نەماو دەست بە نڤیسینیێ ل سەر پیستەکیێ تەنك دكر، نهۆژی بۆ هندەك مەرەمێن تایبەتی ل سەروان ڕەنگە پیستا دهێتە نڤیسین رۆمانییا ل سەر قورمێن دارا دنڤیسی، بە مەرجەكی تەخەیەكا شەمییێ د وی قورمیێ داریێ د داو پشتی هەنگی ب پارچە كانزایەكی تیپ تێ دكولا.

هەتا نهۆژی ل وەلاتێن رۆژهەلاتیێ پێنڤیسیێ قامیشی دهێتە ب كارئینان، لێ ل ئاڤای پاش سالا ١٨٠٠ زاینی ئێكەمین نكلی كانزاییێ هاتە دروستكرنو وب كار ئینان . ل دەستپێكیێ زۆر ب قەتلازی بە دەست دكەفت هەتا سالا١٨٢٠ز كۆ(جێمس بری) دەست بە دروست كرنا نكلێن كانزایی كر، هەرچەندە هوستایەكیێ باش بوو و نكلێن چاك دروست دكرن لێ زۆر دگران بها بوون.

هند پیێ نەچوو كابرایەكیێ دی ئێنگلیز (جۆسیا ماسۆن) پەیدابوو ئامیرەكیێ دروستكرنا نكلا چێكر، خوییایە بەرهەمیێ ئامیری ژبەرهەمیێ دەست زۆرترو ئەرزانترە لەورا ب زۆری كەفتنە بازاریو مشەبوون

قوتابییا ل قوتابخانێن جیهانیێ هەتا سالا ١٨٤٠ز ژی هەر ب قامیشی یان بە پەڕی بالندە(دنڤیسی) لێ نهۆ پتر ژسەد هزار جۆرێن نكلێن كانزایی بۆ نڤیسینیێ هەنە، ئەڤـــ نكلە ژی هەروەسا ب سانەهیو خوشنڤیس نەبوون بەلكی شازدە جارا دەستكارییا وان هاتیە كرن هەتا هوساب ڕێكو ڕەوانی بنڤیسن.

نكلێن زێڕی ژی هەنە كۆ هەتا چل جاران پتر دەستكارییا وان هاتیە كرن . پێغەمبەریێ ئیسلامی(د. خ) چەند نڤیسەرەك هەبوون دەمێن قورئان بۆ دەهاتە خواریێ داخاز ژ وان نڤیسەرا دكر بنڤیسن، هەروەها مەرجەك دانا بوو بۆ ئازاد كرنا دیلێن شەڕیێ (بەدر) كۆ هەر ئێك ژوان دیلا دەه زارۆكا فێری خاندنو نڤیسینیێ بكەت دیێ هێتە ئازاد كرن.

# فەرهەنگۆك

| پەیڤ | رامان |
| --- | --- |
| مەدەهوشی | سەرسوڕمان |
| هەڕی | قوڕ |
| تاڤـــــ | خۆر ، هەتاو |
| ل جەم | لەکن |
| کەڤر | بەردی گەورە |
| قورمێن دارا | قەدی دار |
| تەختەیەکا شەمایێ | چینێکی مۆم |
| نکل | نووك |
| دم | دەنووك |
| مشە | زۆر |
| لێ نێڕی | دەینۆڕییێ، تەماشای دەکات |
| ترۆژکێن رۆژی | بە تیشکی هەتاو، تیشکی خۆر ، تیشکی رۆژ |
| دڤی بیاڤیدا | دڤی بواریدا ، لەم بوارەدا |
| دهۆستاو شارەزابوون | وەستاو شارەزابوون |
| تیپ | پیت |
| تێدکۆلا | دەیان کۆلا |
| بەقەتلازی | بەزەحمەت |

# هەزار مێرد

لە بەرەبەیانی مێژووەوە، مرۆڤایەتی بە گەلێ چەرخ دا تێپەڕیوە..

بۆ ئاسانی و لێ دووان، مێژوو نووسەکان کردوویانە بە دوو بەشەوە.

یەکەمیان : چەرخەکانی بەر لە مێژووە کە دێرینێکی زۆر کۆن و دوورو درێژی ئادەمیزادو مرۆڤایەتی بووە هەتاکو سەردەمی بەکارهێنانی (نوسین)

کۆنترین چەرخەکانی چاخی(بەر لە مێژوو) پێی ئەگوترا(سوورپ، یان چەرخی بەردی) ئەمانەش دابەشکراون بە چەرخی بەردی کۆن و چەرخی بەردی نوێوە، کە درێژ ئەبنەوە تا چەرخەکانی دووەمی (مێژوو)کە بە نووسین و تۆمارکردنی ڕووداوەکانی مرۆڤایەتی دەست پێدەکات.....

چەرخی بەردی کۆن ماوەیەکی زۆر دوورو درێژبووە کە هەزارەها ساڵی خایاندووە..... ئادەمیزاد بە سادەیی و ساکاریی تێیدا ژیاوە.

پشکێنەرو مێژوونووسەکان، بەهۆی گەڕان بەدوای پاشماوەی کۆن و دێرین و کەلوپەلی یەکەم جار لەبەرد درووست کراوە، هەڵکۆڵین و هەڵکەندنی ئەو وێنانەی کەلەسەر دیوارو بنمیچی ئەشکەوتەکاندا داتاشراوون و ماونەتەوە ......هەروەها بەهۆی دۆزینەوەی ئێسقانی ئادەمیزادو ئەو ئاژەڵانەی کە ڕاویان کردوون، مێژووی ئەو سەردەمانەو جۆری ژیانیان بۆ دەرکەوتووە.

پاشماوەی چەرخی بەردیی کۆن لەگەلێ جێگای گێتیدا دۆزراوتەوە، بەتایبەتی لە ڕۆژهەلاتی ناوەڕاستو لەبەشی کوردستانی عیراق.....لەنزیك سلێمانیو کەرکوكو چەمچەماڵ .....

پاشماوەی ئێسكو کاسەی سەری ئادەمیزادی کۆن لە شێوەی ئێسكو کاسەسەری مرۆڤی ئێستاکە نەچووە، جیاوازییەکی زۆری هەبووە، ئێسكو پێك هاتنی لە شێوەی مەیموونذا بووە، لەبەرئەوە بەئادەمی چەرخی بەردی

کۆنیان گووتووه (چەرخی ئادەمیزادی کۆن) بەو جۆرە مرۆڤانەیان گووتـووە (نیاندرتاڵ)، بەناوی ئەو شوێنەی کەلە (ئەڵەمانیا) بۆ یەکەم جار، پەیکـەری ئێسکی ئەو جۆرە ئادەمیزادانەیان لێ دۆزیوەتەوە .....

بە دەرکەوتن کـەل و پـەل و شـتی دروسـت کـراوو هەڵکەنـدراوی سـەربەرد و دیواری پاشماوەی کۆنی ئەو ئادەمیزادانەی کەبە (نیاندرتاڵ)ناو نرابوون، لـە ئەشکەوتەکانی هـەزارمێردا دۆزراوەتـەوە کـە نزیـك گونـدی (جـێ شـانەیە)، کەواتـە (هـەزارمێرد) شـوێنێکی مێـژوویی زۆر کۆنـەو جێگـای دیـاری کـراوی ئادەمیزادی(نیاندرتاڵ) بووە کەلە چاخی بەردیی کۆندا ئەوە ئەگەیـەنێ، لـە کوردستانی عێراقدا ئادەمیزاد ژیاوە ............

ئەگـەر لـە (تاسـلوجە) بپەڕینـەوە ڕووەو سـلێمانیی، دوای کـەمێك، سـەرنج بـەلای ڕاسـتدا بـدەین بـۆ ڕیزەچـیای گڵـەزەردە، لای (بـەرانان)، دەمـی ئەشکەوتی هەزارمێرد بەدی ئەکەین، کە نزیکەی (١٣) کیلۆمەترەلە ڕۆژئاوای سلێمانییەوەیە ........ئـەتوانین لاڕێ بگـرین، لـە دامێنـی خـوارووی کێڵگـەی (بەکرەجۆ)وەبە ئۆتۆمۆبێل بگەینـە گونـدی(هـەزارمێرد)، ئـەمجا بـەپێ، یـان بەسـواریی بەچـیاکەدا بـۆ مـاوەی نیـو کاتـژمێر هـەڵ بگـەڕێین ئەگەینـە ئەشکەوتەکە........

ئەم ڕێگەیە نوێیـە، لـەکاتی خۆیـدا یـەکێ لـە پـشکنەری جێمـاوە دێرینـەکان کەناوی (سپایزەڕ) بـووە، لـە سـاڵی١٩٢٦ی زایینـدا، لەشـاری سـلێمانییەوە چووە بۆ گوندی (جێ شانە)، لەوێوە بە ڕێچکەیەکی سەرەولێژ و پێچاوپێچدا گەیشتۆتە کەندەلانێکی گەورە، کە نزیکەی یەك میل لـە جـێ شـانەوە دوورە ...ئەم کەندەلانە ڕێبازێکی سـەرەوژوورە بـۆ ئەشـکەوتەکە، لـە دامێنـی ئـەم ڕێبازەدا قەلاکەی هەزار مێرد هەیە ......

ئەم قەلایە بریتییە لە کابەردێکی ئێجگار گەورە، پڕیەتی لە دۆڵی بەردین کەلەکاتی خۆیدا وا دەرئەکەوێت هەڵ کەندرابێت بۆ ئەوەی ببن بە ئەستێڵی ئاو، زۆرتریش لەوەدەچێ کە ئەمانە لە سەردەمی (ساسانییەکان) دا هەڵ کەندرابن ....پاش نیوەی ڕیگا ڕۆییشتن، کابرا ئەگاتە جێماوە دێرینەکان.

هەزارمێرد یان بەمەبەست هەزار پیاودێت، کەڕەنگە ئەم ئەشکەوتانە جێگای هەزارکەسی تیا بووبێتەوە، یان مەبەست لەهەزار مێرد بووبێت، کەئەگەیەنێ جێگەی سەرکردەی هەزار سەربازی سوپابووبێت لەو سەردەمەدا.

زۆرکەسیش هەیە ئەڵێن کە گوایە(زەردەشت) لە ناوچەی هەزارمێرددا لە دایك بووە، لەم شوێنەدا شەش ئەشکەوتی بە تەنیشت یەکەوە هەیە، یەکێکیان لە هەرە گەورەکەیانەو لە دوورەوە بەدی ئەکرێت، بەرزو پانە بەلام قوڵ نییە، یەکێکی کەلە ئەشکەوتە بچووکەکان بریتییە لە کونێکی گەورە لە شاخەکەدا زۆر توون و تاریك و درێژە، هەتا بڕۆینە ناوەوە پتر تەسك دەبێتەوە، گەلێك جۆر ڕەگ و قەدی ڕووەکی کۆنی تێدایە....گەلێك وێنە و کۆلینی لەسەر بەرد و دیوار و بن میچی هەڵکەندراوە کە ئادەمیزادی نیاندەرتاڵ چوونەتە ناوی، لە سەرما و تۆف بەستەڵەکی زستان و لە ترسی ئاژەڵی دڕندەی ئەو سەردەمە خۆیان تیا پاراستووەو شاردۆتەوە. ئەو جۆرە ئادەمیزادانە دەم و چاو ناشیرینو لچ و لێو ئەستوور و چاو بە قوولا چووی برۆ پەیوەست بوون، قاچ نوشتاوە بوونو بالا ڕێکییان ناتەواو بووە، کە نازانرێ قولاییەکەی تا کوێیە...

لە ئەنجامی ئەو پشکنینانەی کەلە ساڵی١٩٢٨ز دا لەم ئەشکەوتانەدا کراون گەلێ کەل و پەلی لە بەرد درووست کراوی خولی کۆنی چەرخی بەردی سەردەمی (ئەلمیستری) پەنجا هەزارساڵ لەمەوبەر دۆزراوەتەوە، کە هەر

لەدوای ئەمە هەمان چەشن کەڵو پەلی ئەو سەردەمەیان لە ئەشکەوتەکەی (شانەدەر) دا دۆزیەوە.........

هەروەها لە ئەشکەوتەکانی هەزار مێرددا شتومەکی پاش سەردەمی (ئەلمیستری) شیان دۆزیەوە، کە شان لە شانی شتومەکەکانی ئەشکەوتەکانی زەرزێ و شانەدەر ئەدەن لە نرخو بایەخدا .........

بەلاّم لە ئەشکەوتەکانی هەزار مێرددا، هەتائێستە، هیچ قەوارەیەکی ئێسکیی ئەودوو سەردەمە نەدۆزراوەتەوە..........

# ئیسماعیل بێشكچی

ئیسماعیل بێشكچی ساڵی ١٩٣٩ لە (ئیسكلیب) لە نزیك پارێزگای (كۆرم) لەدایك بووە، خوێندنی سەرەتایی و دواناوەندی هەر لەوشارە تەواو كردووە.

بڕوانامەی لیسانسی لە زانكۆی ئەنقەرا و پلەی دكتۆراشی لە زانكۆی ئەتاتۆرك لە ئەرزرووم وەرگرتووە، بێشكچی لەكاتی خزمەتی سەربازیدا لەنێوان ساڵەكانی ١٩٦٢ – ١٩٦٤ دا لە ناوچەكانی (هەكاری) و (بەدلیس) كوردی ناسیووە، بێشكچی دەڵێت:

(كە گەیشتینە خوارووی خۆرهەڵاتی توركیا بۆ تەواوكردنی خزمەتی سەربازی، بە چاوی خۆم گەڵێكم دی، كە زمان و مێژوو و دابونەریتیان لە ئێمەی تورك جیاوازە ئەو گەلە ئەو ناوە هەڵناگرێت كە ئێمە لێمان ناون ئەوان بەخۆیان ناڵێن (توركی چیا) بەڵكە دەڵێن: ئێمە كوردین).

لەو دەمەوە بێشكچی هەموو توانای هزر و چالاكی زانستی خۆی تەرخان كردووە لەپێناوی گەلی كورد دا بە لێكۆڵینەوە و توێژینەوە و داكۆكیكردن لەسەر مافی نەتەوایەتی و دیموكراتیەت و تایبەتمەندیی شارستانیی كورد و هەوڵی ئەوەی داوە كە ڕۆشنبیری میللەتی تورك لەو ڕاستییە بگەیەنێت كە زۆرینە نكولی لێ دەكەن، وەك چۆن دەوڵەتی توركی دژی دەوەستێت، بە ئاگر و ئاسن بۆ حەفتا ساڵ دەچێت بەڵام بەبێ سوود... تا ئێستا لەو ڕێگایەدا (٣١) توێژینەوەی بڵاوكردۆتەوە و زۆر لە كتێبەكانی لەكاتی چاپكردنیاندا دەستیان بەسەردا گیراون و قەدەغە كراون.

ئەو کتێب و توێژینەوانە، وای لە بێشکچی کردووە کە کۆنترین بەندی سیاسی ناو دەوڵەتی تورکی علمانی و دیموکراتی بێت، چونکە بەوە تاوانبار کراوە کە بە نووسینەکانی دەستدرێژی کردووەتە سەر کەرامەت و شەرەفی دەوڵەت و داکۆکی کردووە لە دۆزی کورد، کە تورکیا دۆزی کورد بە کارێك دەداتە قەڵەم کە دژ بە یاسایە و نابێت دەربارەی بدوێت، بەڵام بێشکچی دەڵێت من خەباتی ئاشتیانە دەکەم، تا ڕێم پێبدەن گفتوگۆی زانستی ئەو کارە نایاساییانە ڕاپێچ بکات کە سانسۆر دایناوە لەپێناو پاراستنی شەرەفی تورکی ئەویش بە پشت بەستن بە دەربڕینی سەربەست و پاراستنی مافی مرۆڤ.

بێشکچی ئێستا لە پشت دەرگای ئاسنی بەندیخانەکانەوە ژیان دەباتەسەر، کۆی حوکمی زیندانی نزیکەی دوو سەدە و نیوە تائێستا ١٥ ساڵی لێ تەواو کردووە لە زیندانی مەڵبەندی ئەنقەرەدا خەڵکانێکی زۆر لە ڕۆشنبیران لەناو تورکیا و وڵاتانی دەرەوەدا داکۆکی لە بێشکچی دەکەن و خۆپیشاندن و نارەزایی زۆر بەرەوڕووی دەوڵەتی تورکیا بەرپا دەکەن..... بێشکچی بەهۆی نوسینەکانییەوە پاداشت و خەڵاتێکی زۆر دراوە، لەلایەن وڵاتانی دەرەوە، بەڵام زۆری ئەو پاداشت و خەڵاتانەی ڕەتکردۆتەوە وەك خۆی دەڵێت چونکە ئەو وڵاتانە چەك دەفرۆشن بە تورکیا و تورکیا دژی کورد بەکاریدەهێنێت، هەروەها دەڵێت باشترین ڕێگا بۆ کۆلۆنیالکردنی میللەتێك، ڕێگاگرتنە لەو میللەتە کە کەلەپور و زمانەکەی گەشەبکات و بەکاری بهێنێت.

## لێکدانەوەی وشەکان:

نکوولّی: ئینکار کردن

لیسانس: بڕوانامەی بەکالۆریۆس کە دەدرێت بە دەرچووانی کۆلێژەکان

سانسۆر: چاودێریکردن، ڕێگەگرتن لە بڵاوکردنەوە.

علمانی: سیاسەتی جیاکردنەوەی دین لە دەوڵەت.

دۆز: مەسەلە – پرس

کۆلۆنیال: داگیرکردن، سڕینەوەی ناسنامەی میللەتێك

## چیرۆکی

## (( نان و کەوەری خوێناوی ))

دوا فەردە گەنمی لەسەر کۆڵی خۆی، فڕێدایە سەر ئەوەکانی تر پاش ئەوەی کەمێك هێنای و بردی و خستیە سەر باری ڕێکی خۆی. ئیتر کۆپانەکەی لە شانی داماڵی و بەکەمتەرخەمییەکەوە، هاویشتیە سووچێکی عەلافخانەکەوە، ئەمجا کەوتە خۆتەکاندن لەو تۆز و خۆڵەی لەسەر جلەکانی کەڵەکە بوو بوو، دەستەسڕە چارۆکەییەکەی بەر باخەڵیشی دەرهێنا و ماوەیەکی زۆر سەر و چاو و شان و ملی خۆی پێ پاك کردەوە و دواجار ئاخنیەوە بەر باخەڵی، ئەوسا بەبێدەنگ، لەبەردەم حاجی عەبدولی عەلافدا وەستا، ئەویش هەر زوو، چارەکە دینارێکی بۆ ڕەتکرد و پێی وت:

– ئادەی ... دەڕابەکانیشم بۆ دابدەرەوە.

حاجی چاکەی زۆر بەسەریەوە هەبوو، زۆر جار لەکاتی تەنگانەدا بە فریای کەوتبوو، بە خۆشحالیەوە دەڕابەکانی بۆ دادەدایەوە و قفڵەکانی بۆ تێ قایم کرد لێشی پرسی:

– قوربان فەرمایشتێکی ترت نییە؟!

حاجی لە وەڵامیا بەدڵسۆزییەوە وتی:

نەخێر کوڕم ... لەشت ساغ بێ ... فەرموو خوات لەگەڵ.

ئیتر خواحافیزی لە حاجی کرد و ڕووی کردە ناو بازاڕ، لە نانە ساردەکانی سەر سەبەتەی دەستگێڕەکان، شەش دانەی بە پەنجا فلس، لە دوکانێکی سەوزە فرۆشیش سێ دەسك کەوەری هەڵگرت و بەرەو ماڵەوە، ملی ڕێگەی گرتەبەر.

(مـارف)ی کـۆڵ هـەڵگر، ئـەو ئێوارەیـە گـەڵێك دڵخـۆش و ئاسـوودە بـوو، دەسکەوتی ئەو ڕۆژەی، خۆی دابوو لە سێ چارەکە دینـار، بگـرە بەدرێـژایی هەفتـەی ڕابـردووی، دەسـکەوتی هـیچ ڕۆژێکـی لـە نیـو دینـار نـەهاتبووە خـوارەوە، لەڕاسـتیا، لـەم چـەند مـانگی دواییەیـدا ئەمـەی بـە دەگمـەن بـۆ هەڵئەکەوت، وەیا لە سێ چوار پەنجایی تێپەڕی نەئەکرد، کـە مـەمرە و مـەژی ژیانی پێ بەسەر ئەبرد، بۆیە ئێستا بەدەم ڕێگاوە، بەئاسوودەگییەوە لەگەڵ خۆیا ئەدوا و ئەی وت:

– بەوەی ئەمڕۆ کە پێم ماوە، ئەکاتـە سـێ دینـار و چـارەکێك، وا زسـتانیش نزیك بۆتەوە، دینـار و نیـوێکی ئـەوانی پـێ پۆشـتە ئەبنـەوە، خۆشـم بـەڵکو بتوانم، قـاپووتێکی فـەردەی لێ بکـرم، خـوا مـاڵی ئـەو کەسـە ئـاوا بکـا، کـە جلوبـەرگی فـەردەی داهێنـا، بەڕاسـتی شـتی وەهـای تیـا هەڵدەکـەوێت، کـە ئەگـەر بـە دروسـتکردنی بـدەی، پارەیـەکی بێـشماری تـێ ئەچـێ، خـوا سەرفرازیان کـا ... سـبەینێ دینـار و نیوێـك ئـەدەم بـە (خەجـە)، بـا بـچێت بەئارەزووی خۆی کام جلوبەرگ گەرم و قایمە، بۆخۆی و مناڵەکانی هەڵگرێ، خۆشم بەم ڕۆژگارە لـەناو بـازاڕم، خـۆم ئەنێمـەوە بـۆ قاپوتێـك لـە قوماشـە ئەستوورە تووکنەکان، خۆ بەخوا بە چواردە پانزە پەنجایی، دەستیشم مـاچ ئەکەن، ئینجا ئەو حەلە، زستان با هەر زوقم و بەفر و بارانی خـۆییم بەسـەرا ببارێنێ.

ناسیاوێکی وەك خۆی حەماڵ بـوو، بـەلایا ڕابـردوو سـڵاوێکی گـەرمی لێکـرد، ئـەمیش، زنجـیرەی ئـەو خەیاڵـە خۆشـەی خـۆی پـچڕاند و گـەرمتر وەڵامـی دایـەوە، تـا وردە وردە، بـەدەم ڕۆیـشتنەوە چـووە وە سـەر هـەمان بـاس و خواز:

ئەگەر وەهابێ، من هێشتا دینارێکم لە قاپییا ئەمینێ، لام وایە ئـەویش بدەم بە زەخیرە بۆ زستانەکە، لـە هـەموو شـتێکی تـر باشـترە، ئەیدەم بـە نیسك و نۆك، نەء ... بیدەم بە ڕبەیەك گەنم و بیهارم، وە لە ماڵەوە دای بنێم بـۆ کـاتی تەنگانـە، گـەڵێك باشـترە، کـێ چـووزانێ! ... دوورنیـە سـبەینێ، وەزعەکە ئاڵۆزبێتەوە و هەمیسان بقڵیشێتەوە!... لە ڕاستیا، (مارف)ی کۆڵ هەڵگر لەم بەرچاو تاریکیەدا ناهەقی نەبوو، باری ناو شار، هەردەم لەسەرپێ بوو بۆ ئاڵ و گۆڕێکی ئەوتۆ، کە بەبیری هیچ مرۆڤێکا نەیـەت و هـیچ کەسـێك نەتوانێ، خۆی لە کارەسات و بەسەرهاتی لەناکاوی بەدوور بگرێـت و دواجـار خـۆی لـە دەرد و مەینـەتی و بـەڵای ناگـەهانی بپارێزێـت، ئـەو کـە بـە پیاچوونەوەیەکی خێرا، گشت ڕووداوەکانی پێشووی ناوشاری هێنایەوە پێش چاوی خۆی و، ئەو سزا و ئازاری نەبوونی و برسێتییەی هێنایەوە یاد، کە لـە ئەنجامی ئەو ڕووداوانەدا چەشنی، لە دڵی خۆیا بە ڕەزامەندییەوە وتی:

– کە ڕبە ئاردەکەم لە ماڵەوە هەبوو، بەس نییە ئـەم جـارە خوانـە خواسـتە ئەگەر قڵیشایەوە، لەماڵەوە خۆم مت ئەکەم و بەنانە وشـکییەکەش بێـت ڕۆژ بەسەرئەبەین، هەتا خوا سەرلەنوێ دەروویەکی ڕەحمەتمان لێ ئەکاتەوە.

باسی قڵێشانەوە و کارەساتی سامناکی، ڕستێك پرسیاری لەمێـشکدا بـزوان، لەدڵی خۆیا وتی: باشە ئەمە بۆ؟!...

ئەم گەڕە لاوژە تاکەی درێژە ئەکێشێ؟!...

مـن لـەم کـارە سـەرم ئەماسـێ!... هـەر هێنـدە ئـەزانی و لـەناکاوێکا ئەقڵێـشێتەوە!... لـەناو شـارا نەبێتـە تـاق و تـۆق و بگـرە و بەردەیـەك، ئەوسەری دیارنەبێ!... دواییش کە گەردەلوولەکە کپ ئەبێتـەوە و سـەراپای ناو شار، وەك شاری مردووان خامۆش ئەبێ، سەیر ئەکەی لەم سەرجاردە، یا

لەو ناو کۆڵان، لەناو فلان ماڵا، چەند لاشەیەکی خلتانی خوێنن و لە جەوت ساڵان ڕاست بوونەتەوە سەیرە!... بەڕاستی سەیرە!... ئەمە بۆچی ڕوویداوە و لەپای چی؟!.. ئینجا دوای ئەوەی کەمێك خۆی خەریك ئەکرد و بیری لێ ئەکردەوە، هەر لە دڵی خۆیا بەبێزارییەوە ئەی وت:

– ئەمە لەخۆڕایی نییە ... ئەبێ شتێك لە ئارادا هەبێ، ئەوەی ڕاستی بێت، من تێی ناگەم و سەری لێ دەرناکەم!...

کە بیری لێ کردەوە و سەری لێ دەرنەکرد، وازی لەو باسە هێنا و بیری چووەوە بۆ ماڵەوە ... بۆ ژنەکەی و مناڵە وردەکانی ... وتی:

بەس نییە من خوازنێکی کارامە و سێ مناڵی جوان و ساغ و سەلیمی داومێ، کە ژیانك ڕۆشن ئەکەنەوە و تینم ئەدەنە بەر، بۆ ئەم ڕەنجی فەرهادەی ئەیدەم!.. من چیمە بەسەر ئەم باس و خوازانەوە؟!.

وتراوە نان بۆ نانەوا گۆشت بۆ قەساب... دیارە ئەوانەی لەو ڕێگای قلێشانەیەوە ئەڕۆن، ئەبێ نە ژنیان هەبێ و نە مناڵی ورد!. ئەی ئەگینا چۆن زات ئەکەن. ئەو ڕێگایە ئەگرنەبەر؟. ماوەیەکی تر بەدەم ئەم باس و خوازانەوە ڕۆیشت، شەش نان و سێ دەسك کەوەرەکەی لەبن دەستی توند کردبوو، بێئەوەی هەست بەخۆی بکات دەستی درێژ کرد، پارچەیەکی لە نانەکە پچڕی و نایە ناو دەمی ماوەیەك جووی ... تا زۆر بەتام و کام قووتی دا، ئەوە هەستی برسێتی لێ بزوان و لەدڵی خۆیا وتی: تۆ بڵێی (خەجە)، شۆربایەکی گەرم و گوڕی نەرمەقووتی لێنەنابێ، کە ئێستا بڕۆمەوە و زۆر بەتام و کام ورگمی لێ پڕبکەم؟...

خۆزگە ئەو شۆربایەش، لەپە ساوەرێکی ئاوداری هەریسەیی دەبوو .. ئەزانم لە پەساوەر یان بە گۆشتی چەورەتوە ... ئەشزانم کە ئێمە ئەمڕۆ وەك زۆربەی ڕۆژانی تر، نە گۆشتی چەور و نەبێ چەوریمان نەبوو... بەڵام هەر قایلم... بە ڕۆنیش بێ هەر قایلم... بە ڕۆنیش بێ هەر قایلم ... کوڕە بگرە بەبێ ڕۆنیش بێ هەر کرە ئەکەم، تەنها باش کوڵابێت و وەك کەشکەك لیقاوی دابێتەوە بەمەرجێکیش ئاوداربێت... ئای کە لەگەڵ ئەم نانە و کەوەرەی بن دەستما بەتامە ... ئای کە بەلەزەت و بەتامە ... ئای کە .....

ئا لەم ساتەدا، لەبن دەستی مارفی کۆڵ هەڵگرا قلێشایەوە ... زۆر ناڵەبار قلێشایەوە .. لەسەرەتادا، سێ تەقەی لەسەریەك شلپەیان هات، دوایی چەن دەست ڕێژێك کرا، ئینجا خرم و هووڕ دەستی پێ کرد، ئەمە هەمووی لەچەند ساتێکدا ڕوویدا، مارفی بەسەزمان، هەر لە تەقەی یەکەمەوە وەك هەر جارێکی تری لەوەبەر، خورپەیەك دای لە دڵی و بروسکەیەك بەهەناویا ڕابورد، وەك هەموو جارەکانی تر، تەکانی دایە خۆی کە بەخێرایی هەنگاو هەڵ بێنێتەوە... هەتا هێزی تیایە، هەڵبێت و خۆی قورتار کات، تەنانەت بەبێ ئەوەی هەر هیچ سەیری دەورووپشتی خۆی بکات و بزانێت باس چەباسە؟.. کەچی مارفی کۆڵ هەڵگری بەسەزمان، سەرەڕای ئەو هەموو وریایی و دەست و بردەی، بەفریا نەکەوت!.. کار لەکار ترازابوو!... گوللەی وێڵ، گەلێك لەو دەست و بردە تربوو ... هەر لە زووەوە بە گازەرای پشتی یا نووسا بوو، وە زۆر بێ باك ڕووی کردبووە ناو ناخی دڵی... لەوساتەدا، تەنها هێندەی هەست بەخۆی کرد، کە کسپەیەکی تیژ وەك دەمی گوێزان دڵی ئاگر دا، ئیتر دوای ئەوە، هەستی بە هیچ شتێك نەکرد ... تەنانەت تۆزقاڵێکیش ئازاری نەچەشت، لەپە و ڕوو بەدەما هات، بەبێ پەلە قاژەکردن

و لنگە فرتێ، لەجێی خۆی خپ بوو ... مرد .. نان و کەوەرەکەی بن دەستیشی، خوێنێکی گەشی ئاڵ چۆڕاوگەی تێ بەست و شێوە و ڕەزای گەڵێك گران کرد.

لە ماڵیشەوە، وەك مارف بەسزمان بەئاواتەوە بوو، ژنە دڵسۆزەکەی لەپە ساوەرێکی گەڵێك بەتامی بۆ لێنابوو... سێ مناڵە وردیلە جوانەکانی، پەیتا پەیتا بەدەوری مەنجەڵەکەدا ئەسووڕانەوە و پەلەی تێ کردنیان لێ ئەکرد، دایکەش دەمێك بە خەڵەتاندن و دەمێکیش بەهەڕەشە لێکردن و ڕاونانیان تەفرەی ئەدان، بەو نیازەی ها ئێستا ها ساتێکی تر باوکیان بێتەوە و ئەوسا گشتیان پێکەوە، بەوپەڕی شادمانییەوە بچنە وێزەی مەنجەڵە لەپەساوەر.

کەچی ڕۆژ لەدەم کەلەوە چوو بەودیوا... بانگی ئێوارەی دا... دنیا تاریك داهات... باوك هەر دیارنەبوو... باوك لە مەیتخانەی سەرەوە، لاشەیەکی بێ گیانی خەڵتانی خوێن بوو، فڕێ درابوو... هێجگار بە کەمتەرخەمییەوە فڕێ درابوو.

١٩٦٩

حسێن عارف

## گفتوگۆ:

١- ئەو زاراوانەی کە تائێستاش ماون و گوزارشت لە ڕۆژانی کوشت و بڕی دوژمنانی نەتەوەکەمان دەکەن، زاراوەی (قڵیشایەوە)... دەکرێت لەگەڵ مامۆستا، گفتوگۆ لەسەر ئەم زاراوەیە بکرێت، بەواتا وەسفکردنی ئەو ڕۆژە خوێناویانە...

٢- (مارف)ی کۆڵ هەڵگر لە هەندێك شت نەزان و ساویلکەیە، دەکرێت، باسی ئەو شتانە بکرێت...

٣- ئەمە نموونەیەکە لە چیرۆکی کورت... لەگەڵ ئەوەشا نابێت لەبیرمان بچێت کە چیرۆکی مام ناوەندیش هەیە، کە پێی دەگوترێت (نۆڤێل یان نۆڤێلا) ... هەروەها چیرۆکی درێژ و ڕۆمانیش هەیە ... ئەوەی کە ئەم جۆرە چیرۆکانە جیادەکاتەوە.

أ- ماوەی ڕووداوەکان.

ب- ژمارەی کەسەکان.

دەکرێت بەهۆی مامۆستاوە لە هەریەك لەم جۆرانەی کە باسکران، چەند نموونەیەك بهێنرێتەوە ... لە (ئەدەبیاتی تازەی کوردیماندا) ...

# هەڵوێستی جوامێرانە

**لێدوانەکەی سەرکردەی بەڕێز**

**هۆشەنگ: مەعەممەر قەزافی**

بەڕێز ((مەعەممەر قەزافی)) لە ٢٠ / ٢ / ١٩٩٩ لەدوای گرتنی (عەبدوڵا ئۆجەلان) ئەم لێدوانەی دا: من لەم ساتەدا چەند وشەیەکی کورت ئاراستەی سێ لایەن دەکەم لەم جیهانەدا، بۆ برا تورکەکان و برا کوردەکان و ئەو دەوڵەتانەی کە بەشدارییان لەم گرتنەدا هەبوو، بەنیسبەت برا تورکەکانمانەوە دەمەوێت ئەوە بڵێم کە خۆیان نەخەڵەتێنن و لەخۆیان بایی نەبن و دڵخۆش نەبن، ئەمە ئەگەر شتێك هەبێت ئەوا ئەوە دەگەیەنێت کە ئێوە لە مێژووی خۆتان نابەڵەدن و بەم سەرکەوتنە ساختەیە خۆتان لە خشتە دەبەن... چونکە (ئەستەمبووڵ) پێش ئێوە شادمان بوو کاتێك سەری (غۆمە) و (عەبدولجەلیل) و (یەحیا سویدییان) پەڕاند و بۆ (ئەستەمبووڵ) یان گواستەوە، ئەوکاتە وتیان کە چەتە و یاخی بووەکان و جودا خوازەکانی (تەرابولس) مان دەستگیر کرد و لەناومان بردن، بەم شێوەیە (لیبیا) هەتا هەتایە دەبێتە پاشکۆی (ئەستەمبووڵ) ... دیارە مێژووش بەم جۆرە عەقڵیەتە پێدەکەنێت و گاڵتەی پێدێت کە عەقڵیەتی (ئەستەمبووڵە) ... ئەوا لەبەرچاومانە کە (لیبیا) دەوڵەتێکی سەربەخۆی خاوەن دەسەڵاتە، ئەو خۆشییەش تەنها خۆتانی پێ خەڵەتێنرا، دوای ئەوەی جارێکی تر (ئەستەمبووڵ) بەوە دڵشاد بوو کە گوایا شۆڕشگێڕانی نەتەوەی عەرەب وەکو: شەهیدان (عەبدولکەریم خەلیل) و (عەبدولحەمید زەهراوی) و (شوکری عەسەلی) و (عەزم) و (شەهابی) و (سەلیمی جەزائیری) و (ئەمیر عومەر عەبدولقادری جەزائیری)، کە لە لایەن دادگای (ئەستەمبووڵ) بەوە تاوانبار

کرابوون کە گوایا ئەوانە جواد خوازن... لەچوارچێوەی ئەو دادگایی کردنـەدا کە بە گەلێك بیانووی پڕوپووچەوە بەشێوەیەکی ڕاستەوخۆ تاوانبـار کـران... تـاوانی چـی؟. تـاوانی سـەربەخۆیی عێـراق و سـوریا و فەڵەسـتین و تـەواوی وڵاتانی عەرەب لە دەوڵەتی عوسمانی .... ئێستاش ئەوا دەوڵـەتانی عـەرەب سەربەخۆن دەوڵەتی عوسمانیش لەناوخۆیدا کۆتایی هات...

کـەوابێت تـەواوی بۆچـوونەکانتان گاڵتـەجاڕی لێدەرچـوو. ئـەوا مێـژووش بـە ئەستەمبووڵ پێدەکـەنێت، لـەناوبردنی ئـەو سـەرکردە شۆڕشـگێڕانە نـەبووە هۆی لەناوبردنی نەتەوەی عەرەب و لەدەستدانی سەربەخۆیی ئەم نەتەوەیە. دیمەنی (عەبدوڵا ئۆجەلان) کە نایناسم و وڵاتەکەشم هیچ پەیوەندییـەکی بـەو پارتەوە نییە، تورکیاش ئەمە زۆر چاك دەزانێت، دەڵێم جیهان ئەم دیمەنـەی تەنیا لەم یەك دوو ڕۆژەی بـەر لـە ئێـستاوە نـەبینیوە، بـەڵکو پێـشتر چـەند جارێك پێی ئاشنا بـووە، کاتێـك کـە شۆڕشـگێڕی نەتـەوەی عـەرەب (نەخلـە مـەتران ئەلبەعلەبـەکی) بەچـاو بەسـتراوی و کەلەپـچە کـراوی، جەندرمـە تورکەکان پەلکێشیان کرد و لەڕێگا کوشتیان... ئەوکات ئەستەمبووڵ جـاڕی داو گوتی: ئەم چـەتە جوداخـوازە لـەناوبرا و بەتـەواوی بەسـەر بزووتنـەوەی جودا خوازیـدا سـەرکەوتین و تـەفروتوونامان کـردن... دیـارە ئەمـە بزاڤێکـی جودا خوازی نەبوو... بەڵکو سەربەخۆیی میللـەتێك بـوو... لەلایـەکی تـرەوە قسەم بۆ برا کوردەکـانم ئەوەیـە کـە ئێـستا لـەم سـاتەدا پێیـان ڕابگەیـەنم و بۆیان ڕوون بکەمەوە کە دڵیان سـارد نەبێتـەوە و غـەمگین نـەبن، هـەرکاتێك دوژمنەکانتـان خوێنی ڕشتن ئەوا زیاتر شۆڕشی کوردسـتان کڵپـە دەسـێنێت، وەك ئەوە وایـە کـە بـەنزین بکرێـت بـە ئـاگردا... بـا زیـاتر خوێنتـان بڕێژن، چونکە ئەمە دەبێتە هۆی ئەوەی کە کڵپەی شۆڕشـی سـەربەخۆیی میللـەتان

زیاتر هەڵچێت... نکووڵی لە سەربەخۆیی میللەتان کارێکە کە گەمژەیی و کاڵفامی دەگەیەنێت و نەزانی لە مێژوو دەردەخات ... هەرچەندە ئەمڕۆ، ئیمپراتۆریەتە ملهوڕە دڕندەکان هێزی زوڵم و دوژمنکار و پراگماتیکی میکافیللی بێ ویژدانە و نکووڵی لە مافی میللەتان دەکەن، لەئازادی و سەربەخۆیی و ژیانێکی شیاو لەژێر خۆردا، دەڵێم هەرچەندە ئەو هێزانە کۆك بن بۆ لەناوبردنتان ئەوا ئێوە هەر سەردەکەون... ئەو ئیمپراتۆیەتانە لەناو دەچن، هەروەك ئیمپراتۆریەتەکانی پێشوو نگرۆ بوون، لەسەرووی هەموویانەوە ئیمپراتۆریەتی عوسمانی کە شۆڕشگێڕانی عەرەبی دابلۆسی و وای لەقەڵەم دەدان کە ئەمانە جوداخواز و ڕێگر و چەتەن.

ئێستاش مێژوو بەو ئیمپراتۆریەتە و بەخودی ئەستەمبوولێش پێدەکەنێت... ئەو دەوڵەتانەش کە هاوبەشیان لەو پیلانەدا کرد، کەمترین شت کە پێیان بگوترێت ئەوەیە، ئەو دەوڵەتانە خوێڕی و ترسنۆکی بێ ویژدان و بێ ڕەوشتن، ئەمانە پیلانیان لەدژی پیاوێك گێڕا لەئەنجامی ڕێکەوتنێکی ناپەسەندی خۆپەرستانەی هەمە لایەنە، ئەو دەوڵەتانە پێویستە شەرمەزار بکرێن و گەمارۆ بدرێن، ئەمە کەمترین شتە کە بەرامبەر ئەو کردەوەیە کردیان، کە بە کردەوەیەکی ترسنۆکی غەڕا دەبێت، لەقەڵەم بدرێت... خەباتی ئێوەش ئەی برا کوردەکان بەبێ دوودڵی بەردەوامە تا سەرکەوتن.

## بۆ زانین

١– ئەم سەرکردە بەڕێزە، گەڵێك جار داوای مافی ڕەوای میللەتی ئێمەی کردووە تا دەگاتە مافی چارەنووسی تەواو، کە لەساڵی ١٩٧٧ لە کۆبوونەوەیەکی بەر بڵاوی بزاڤەکانی ڕزگاری جیهانی کە لە (تەڕابلوس) پایتەختی (لیبیا) بەسترا، پشتیوانی خۆی ڕاگەیاند.

٢– بزاڤی جوداخوازیی و سەربەخۆیی میللەتان: لە برگەی یەکەمدامەسەلە زەوتکردن و داگیرکردنە، بەڵام لە دووەمیاندا، ئەوا مافێکی سروشتی و ڕەوای هەموو میللەتێکە کە بە مافی چارەنووسی خۆی شاد بێت ...

### لێکدانەوەی وشەکان:

نابەڵەد : نەشارەزا

بزاڤ : جوڵانەوە

پراگماتیك : پراکتیك، شێوازی عەمەلی

میکافیللی : زانایەکی ئیتاڵی بوو، مەبەست لای ئەو هەموو کارێك با مەیسەر بێت بەهەر شێوازێك بێت، ئێستاش بۆتە تیۆرێك بۆ کاری ساختە و فڕوفێڵ و لەخشتەبردن...

ناپەسەند : نارەوا – نابەجێ

خۆپەرستی : خۆویستی – ئەنانی

کاڵفام : بێ عەقل، پێ نەگیشتوو.

# ئافرەتی کورد

((کەمال مەزهەر))

گەڕیدە ئەوروپاییەکان گەلێکیان بەشان و باهووی ئافرەتی کورد هەڵداوە، بەڕادەیەك جاروبار خۆمانمان لەبیردەچێتەوە، وابزانم ئەو گەڕیدانە بێ نیازی خراپ کەمێك زۆر ڕۆیشتوون، وادیارە کە لە کۆڵانە تەسکەکانی شارە داخراوەکانی ڕۆژهەڵاتەوە هاتوونە ناوشاخ و داخە کراوەکانی کوردستانەوە، کەمێك سەریان لێ تێکچووە، بۆیە کە ئافرەتانی کوردیان لە ئافرەتی دەوروبەریان باشتر هاتوونەتە بەرچاو.

ڕاستە ئافرەتی کورد پێ خاوس نییە، بەڵام ئافرەتانی هەموو ناوچە شاخاوییەکانی جیهان هیچ کاتێك هیچ کامیان پێ خاوس نەبوون چونکە نە سەرما و سۆڵەی زستان و نەتەڵەزمی بەردی شاخەکان ڕێگەی پێخاوس نادەن، هەر ئافرەتێکی دەشتەکانی هیندستان بهێنینەوە ناو شاخەکانی کوردستان دەبێت نان لە دەمی خۆی و زارۆڵەکانی بگرێتەوە تا پارەی جووتێك پێڵاو بۆخۆی و بۆ ئەوان پاشەکەوت دەکات، بەهەمان دەستوور ئافرەتی لادێی کورد کەمێك لە ئافرەتی لادێی چەند شوێنێکی تر پۆشتەترن حەزیان لە ئاڵ و واڵا زۆرە، جل و بەرگیان دڵ دەکاتەوە، بەڵام ئەمیشیان بەرهەمی سروشتە، ئەو ئافرەتە چاوی بە سەوزایی و شینایی و گوڵاڵە سوورەی دڵڕفێن کردۆتەوە و هەمیشە ئەو ڕەنگانە دڵ و هەستیان بزاوندووە، خۆئەگەر تەواو پۆشتەش نەبێت ئەوا بەرگەی بەفرانبارێك ناگرێت، دیسان ڕاستە ئافرەتی لادێی کورد عەبا و پەچەی نەزانیوە، بەڵام هەر ئەوەمان مابوو ئەو ئافرەتانە بە عەبا و چەپەوە نەبا و دڕك و داڵی ناو کەندەڵان و چڕەداری دارستان و لێشاوی ئاوی ناو گەلییەکاندا مەشکە و هەمانەی پڕ

بگوێزنــەوە، هــەر ئــافرەتێکی عەجــەم ڕێــی بکەوتایــە کوردســتان دەبــوو بەرلەوەی دەست بۆ هیچ بەرێت عەبا و پەچەکەی فڕێ بدات، بڕوانە سـەیرانە تێکەڵەکانی ئەمڕۆش دەبینن باجی ڕەعنا و باجی مـرووەت وەك کنێـر و وەك ڤیان بێ عەبا و پەچە هاتوچۆ دەکەن.

مەبەستم لەو قسانە ئەوەیە بڵێم ئافرەتی کورد نە هیچی لە کەس زیاترە و نە هیچیشی لەکەس کەمترە، (بێکەس) وتەنی ((گـیرۆدەی دەسـتی زوڵـم)) بـوو ئەو ساکە وەك هەموو دەستە خوشکێکی گـیرۆدەی تـر دواکـەوتوو دەبێـت و شــەقڵی ئــەو دواکەوتنــەی پێــوە دیاردەبێــت، وابــزانم لەگــەڵمانی گــەر بڵــێم پێویستە کورد لەهەموو کەس زیاتر لە داڵغەی ڕۆمانسییەوە بەدوور بێت.

ئافرەتی کورد وەکو هەموو ئافرەتانی جیهان، بەدرێژایی مێژوو گیرۆدەی بـێ ماف و زۆر و ستەمی کۆمەڵ بووە، ژمارەیەك لە داب و نەریتە هەرە ناشـرینە دەستکردەکانی ژیان ڕەگ وڕیشەیان لەناوماندا داکوتاوە، لە لادێکان هێشتا ژن بــە ژن و شــیربایی هــەرماوە تەنانــەت لــە شــارەکانیش دەگمــەن کـچمان بەئارەزووی خــۆی شــوو دەکـات. مــارەیی و پــەڵپ و نــازو نــووزی ماڵــە کـچ، بوونەتــە کۆســپێکی گــەورە لەبــەردەم ژن خواســتندا، (قــانع) هەقییــەتی مارەبڕینی ناو ناوە ((بەپارە کڕین)) ... تا دوێنێ هــەبوون شـانازیان دەکـرد کە تەنێك لۆکە بەشێك لە نیشانەی ماڵە زاوا بــوو، هەشـبوون هــەر بـۆ ئــەوە، لیك بەلا لغاویاندا دەهاتەخوارێ، نەیاندەزانی چۆن بۆڕی ئەو بیر تیژانە بدەن لۆکەیان کردە دیاریی دەستیان.

پەیوەنـدی نێـوان بـووك و خەسـووی ئیمرۆمـان جیاوازیـەکی ئـەوتۆی لەگەڵ ڕابردوومان‌دا نییە، جاری وا هەیە خراپتریش بووە، بەڵگەش ئــەو وشــە نوێیەی ناو زمانی کوردییە کە بووکەکانمان ڕێکوپێك بۆیان داتاشیوین بەوەی

(صبار)ی درِك ژهراویی عەرەبیان کردۆتە زمانی (خەسوو) ... نەخوێندەواری باڵی ڕەشی بەسەر زۆربەی هەرە زۆری ئافرەتانی کوردستاندا کێشاوە، ئەم نموونەیە لە ڕابردووی نزیکمان دێنمەوە:

ساڵی ١٩٥٢ لە هەموو پارێزگای هەولێر تەنیا ٧٥٩ و لە هەموو پارێزگای سلێمانی تەنیا ١١٣٢ کچ دەچوونە قوتابخانەی سەرەتایی، ژمارەی نەخوێندەوارانی هەردوو پارێزگاکەش هی هەولێر (١٠٧٩٤٠) هی پارێزگای سلێمانیش گەیشتبووە (١٠١٨٨٦) کەس.

نامەوێت زیاتر دڵگیرتان بکەم بۆیەکا لەو ژمارە زۆرانەی دەربارەی پێش پەنجاکان کۆم کردوونەتەوەهیچتان بۆ ناهێنمەوە، بەداخەوە تا ئەمڕۆش ڕووناکبیرانی کورد، دەستەیەك شاعیریان نەبێت، وەك پێویستە هەستیان بەم کەلێنە گەورەیەی ژیانی گەلەکەیان نەکردووە، کوردستان یەکەمین ڕۆژنامەی کوردیی کۆتایی سەدەی ڕابردوو چەند جارێك لەو شوێنانەدا کە بە ناوی ئایینەوە کوردی بۆ خوێندن هانداوە ئافرەت و پیاوی تێکەڵکردووە، کەچی دوای نزیکەی نیو سەدە کون و قوژبنی ژمارەی ساڵێکی گۆڤارێکی بۆ ئافرەتی کورد تێدا بدۆزیتەوە.

لەم مەیدانەدا وەك زۆر مەیدانی تری ژیانی ڕووناکبیریمان، شاعیران بۆڕی ئەوانی تریان داوە، نێرو مێ لای حاجی قادری کۆیی فەرقیان نەبووە، مەلای گەورە چەند جارێك لە شیعرەکانیدا بە وردی هاتۆتە سەر باسی ئافرەتی کورد، بۆ چاکە هانی داون و بە توندی ڕەخنەی لەو داب و نەریتانە گرتووە کە ئافرەت گیرۆدەیانن، مەلای گەورە وەك باوکێکی دوور بین بەر لە هەمووان لە کۆیە کچەکانی خۆی خستەبەر خوێندن، (بێکەس)یش بە گەرمی ئافرەتی کوردی بۆ تێکۆشان و سەرپۆش فڕێدان هاندەدات، لە چلەکاندا

((نەسرین دەمێکە))ی (بێکەس) ببووە سروودێکی نیشتمانیی ئازادیخوازانی کورد قەڵشی کوڵمی سووتاوی کچی لادێ و ڕەنجەڕۆیی کیژی شێخ و کیژی حاجی و کیژی ئاغا، سەرنجی ((هێمن موکریانی)) یان ڕاکێشا ((گۆران)) توندو تیژ ترین دەنگی بێزاریی لەباری پڕ جەور و ستەم و دواکەوتوویی ژیانی کوردەوە دەربڕیوە.

کەسمان نییە نەزانێت کە ئافرەتی کورد بەش بەحاڵی خۆی لە کۆڕی خەباتدا درێغی نەکردووە، لێرەدا تەنیا چەند ڕاستیەکی کەم زانراو یان نەزانراو دەخەمە بەرچاو ... (حەپسەخانی نەقیب) ئافرەتێکی لێهاتوو بوو، لە بیست و سییەکاندا چەند جارێك نامەی تایبەتی ناردووە بۆ بارەگای یەکێتی نەتەوەکان لە (جنێف) و تێیدا باسی ئەو جەور و ستەمە زۆرەی کردووە کە بەسەر کورد هاتوون، ئەو نامانە ئێستە بوونەتە بەڵگەی گرنگ بۆ لێکۆڵینەوەی مێژووی نوێی گەلەکەمان.

((میناخان))ی هاوسەری ((قازی محمد))ی نەمر لە ڕژگاری کۆماری مەهاباد دا جێگەی ((حەپسەخان))ی نەقیبی گرتبۆوە، وادیارە خەریکی دامەزراندنی یەکەم ڕێکخراوی ئافرەتان بوو، لەسەردەمی پاشایەتیدا کچە کوردەکانی زانکۆی بەغدا ئازایانە لە خۆپیشاندانە نیشتمانی و ئاهەنگە نهێنیەکانی نەورۆزدا بەشدار دەبوون، ئەم ناوانە بەشێکن لەوانەی بەچاوی خۆم دیومن و لەبیرمن:

خوالێخۆشبووان، (ڕووناك زوهدی) و (نەوزەر نووری) و (نازەنین ساڵح قەفتان) و (حۆری عەلی ئاغا) و (درەخشان عارف نەجیب) و (شەفیقە ئەحمەد) و (درەخشان شێخ جەلال) و (زەکیی عومەر سام ئاغا) و (سورەیا

موحەمـەد) و (نـەزیرە ڕەشـید) و (ناجیـە مـستەفا) و (گوڵـشەن رواندزی) و (ژمارەیەکی تر کە بەداخەوە نایەنەوە یادم).

هیوادارم باری ژیانی ئافرەتانی کورد و مێژووی بزووتنەوەیان زیاتر سـەرنجی نووسـەرانمان ڕابکێشن و گـەلێك بەرهـەمی تـری وەك (ئـافرەت لـە چیرۆکی کـوردی) ی (سـەباحی غالـب) و خـەباتی شـیعری کـوردی لـەپێناو ئـازادیی ئافرەتاندای کاکە حەمە و (ئافرەتی لادێی کورد) ی کاك بورهان قانع، بەشێك لە کەلێنەکانی کتێبخانەی کوردی پڕ بکەنەوە.

## بۆ زانین:

١- کەمال مەزهەری زانا و مێـژوو نـووس ... سـاڵی ١٩٣٧ لـە (ئاغجەلـەر)ی سەر بە پارێزگای کورکووك لەدایکبووە، لە سلێمانی خوێنـدنی سـەرەتایی و ناوەنـدی و دواناوەنـدی تـەواوکردووە. پلـەی دکتـۆرا و دکتـۆرای نـاوکی لـە پەیمانگـەی ڕۆژهەڵاتناسـی سـەر بـە ئـەکادیمییای زانـستەکانی سـۆڤیەت وەرگرتووە.

## کتێبەکانی:

١- کوردستان لە ساڵەکانی شەڕی یەکەمی جیهاندا.

٢- تێگەیشتنی ڕاستی و شوێنی لە ڕۆژنامەنووسی کوردیدا.

٣- ئافرەت لە مێژوودا.

٤- مێژوو – کورتە باسێکی زانستی مێژووی کورد و مێژوو.

٥- چینی کرێکارانی عیراق و گەلێك کتێبی تر.

٦- چەند کتێبێکی تری هەیە کە ئامادەن بۆ چاپ

٧- گەلێك کتێبی تری هەیە بە زمانی بیانی (تورکی – فارسی – فەڕەنسی).

# قــەدەم خێر

لەبزووتنــەوەی ڕزگــاری کــوردا وەنــەبێ هەرخــەبات و خۆبــەخت کــردن پیــشەی پیــاو بــووبێ، بــەڵکو بەســەدان لــەئافرەتانی کوردســتان لــەپێناوی نیشتماندا قارەمانییــەتیان ئەگــەر لــەبراکانیان پــتر نــەبووبێ کــەمتر نــەبووە، قەدەم خێر یەکێکە لەو ئافرەتە کوردە شۆڕشگێڕە قارەمانانــەی بەشۆڕشــی چەکداریی هەڵسا دژی ڕژێمی شــایەتیی لەئێرانــدا، لەســەردەمی ڕەزاشــادا، کەبرا قارەمانەکەی (یوسف)خان کرا بەپەتی قەنارەدا، بەرامبەر ئەم کردەوە دڕندەییە بەدەنگ هاواری نیشتمانەکەیەوە هــاتو ئــاڵای خــەبات و شۆڕشــی هــەڵگرت دژی زۆرداریــی وچەوســاندنەوە، بڵێــسەی ئــەم شۆڕشــە لەهــەرێمی (هەمــەدانو لوڕســتان)دا بــەرزبووەوە کــەتا حــەوت ســاڵ درێــژەی کێــشاو ســوپای دوژمنــی وونجڕوونجــڕ کــرد. ئــەم ســەرکەوتنە گەورانــەی شــۆڕش گێڕەکان پاڵی بەدوژمنەوە نا لەشکرێکی گەورە ئامادە بکــات بۆلــەناو بردنــی شۆڕشــەکە بەفەرمانــدەی ســەرهەنگ(ســەقەفی)وەبەیارمــەتی (عومــەر خــانی شوکاک)و چەند ناپاکێکی کوردی تــر لەســەرۆکی هۆزەکــان وهێرشــیان بــردە سەر شاخی (کەورکو)و گەمارۆی شــۆڕش گێــڕە قارەمانــەکانیان دا تامــاوەی سێمانگ، بەڵام ئەم شۆڕش گێڕانە، بەسەرکردایەتی قــەدەم خێــر، بەرامبــەر بەهێزی دوژمــن قارەمانانــە خۆیــان گــرتو جــەنگین تاچــەك وئازووقەیان نــەما وەناچاربوون خۆیان بــدەن بەدەســتەوە. دوژمنــی خــوێن ڕێــژ قــەدەم خێــری ڕەوانەی تاران کرد وەلەزیندانەکانی ڕەزا شاداسیساڵ مایەوەو تابەنەخۆشی یوەرەم لەناو زیندانەکەیدا گیانی پاکی دەرچوو. بــەم جــۆرە گیانــە شــۆڕش گێڕەکەی تێکەڵ بەگیانی هەزاران شۆڕش گێڕی تــر بــوو کــەخۆیان لــەپێناوی کوردو کوردستاندا بەخت کرد.

# گوڵ و گیا لە پزیشکیدا

لەبەر ئەوەی کەپەنجەی سروشت لـە بەهاراندا لاپاڵ و دەشت و گـویّ ئاوەکـانی کوردسـتانمان بـەگوڵوگیای فـرە چەشـن بۆئەنەخـشێنیّ. باوكوباپیرانیشمان ئەم گوڵ و گیایانەیان بۆ پزیشکی بەکارهێناوە و بۆگەلێك نەخۆشـی سـوودیان لیّ وەرگرتـووە. وەبـۆ نموونـە هەنـدێکیانتان بۆبـاس دەکەین.

١- گوڵە بەیبوون پاش ئەمەی ئەکولێنریّ ڕەنگاوەکـەی ئەخورێتـەوە بۆژانـە سك زۆر بەکەڵکە.

٢- ڕیحانە کێویلە :پاش کولاندنی ڕەنگاوەکەی ئەدریّ بەوکەسانەی کەخوێن هەڵ دێننەوەو خوێنەکە بەربەست ئەکات.

٣- گوڵە زەردە: جگە لـەوەی کەئـەکریّ بەحـەڵوا وەکـو چـاش ئـەکولێنریّو بۆژانە سك دەرخواردی منالی ساوا دەدرێت.

٤- خاشخاش: بەوشکی ئەکولێنریّو لەگـەڵ شـەکردا تێکـەڵ ئـەکریّ ئـەدریّ بەوکەسانەی کە کەم خەون.

٥- گـوڵی (گاوزمـان) کـە وەکـو وەنەوشـە وایـە لەگـەڵ لیمـۆی بەسـرە ئـەکولێنریّو ڕەنگاوەکـەی ئـەدریّ بـەو کەسـانەی کـەلم لـە گورچیلەکەیاندا هەیە.

٦- بنی ڕێواس: پاش ووشك کردنەوەی ئەهاڕڕێتەوەو لەگەڵ شەکردا تێکـەڵ ئەکریّ و دەرخواردی ئەو کەسانە ئەدریّ کەتووشی برینی (شێرپەنجە)بوون.

٧- گەلای بی: کوتراوەو ئاوەکەی دراوە بەوکەسانەی لەرزوو تایان بووە.

٨- گەلاگۆییژ: لەپاش وشك کردنەوەی کوتراوەو کـراوە بەچـاو دەرخـواردی ئەو کەسانە دراوە کەنەخۆشی (شەکرە)یان بووە.

٩- گەلآی سینەمەکی : پاش کولآندنی بۆڕەوانیی خواردراوەتەوە .

١٠- تۆوی (کەتان) : کوتراوەو خراوەتە سەر دوومەڵ بۆ دەربوونی.

١١- جەوی بادامی شیرین : وەکو نوقڵ مژراوە بۆتەنگەنەفەسی بەکارهێنراوە.

١٢- گەلآی دار بەڕوو: بە وشکی هاڕراوەتەوەو ئەوانەی کەخوێنی لووتیان بەربووە هەڵیان مژیوەو خوێنەکەی وەستاوەتەوە.

١٣- گوڵە هێرۆ: کراوە بەچایی و دەرخواردی ئەوانە دراوە کەشەو زۆر ئەکۆکن.

١٤- گیا وەردێنە: کوتراوەو لەکاتی چاو ئێشەدا خراوەتە سەر چاو.

١٥- مازووی شینو شەکر بەیەکەوە هاڕراوە بۆوەستاندنەوەی سک چوون خوراوە.

١٦- گەزۆ: دراوە بەوکەسانەی کەتووشی سوورێژە بوون.

# خوێندنەوە و لێکۆڵینەوە

لـەجیهانی ئـەمڕۆ دا، خوێندنـەوە بـووە بەرەوشـتێکی سـوود بـەخش و بەکـەڵك. وەنـەبێت هـەموو خوێندنەوەیـەکیش ئـەو کەڵکـە ببەخشێ چـونکە جۆری خوێندنەوە ئەم لایەنە دیاری ئەکات. خوێندنـەوە ئەگەرهـەر بۆوەخـت بردنـە سـەربێت، ئـەوا بـێ گومـان ئـەنجامێکی وانـادات بەدەسـتەوە، بـەڵکو پێویـستە خوێندنـەوە بەلێکدانـەوەو لێکۆڵینـەوەوە بـێ. ئـەتوانین هـەر لەسەرەتاوە خۆمان بەوە ڕابێـنین کەلـەکاتی خوێندنـەوەدا بـە وردی سـەرنج بدەین وەلەو زانیارییانەی لە کتێبێکایە بکۆڵینەوە، ئەو وەختە هەسـت بـەوە ئەکەین کە ڕۆژ لە ڕۆژ زانیاریمـان هـەر لـەفراوان بووندا ئـەبێت و لێکدانـەوەو بیرکردنەوەمان توانایەکی کەی ئەبێت.

لەکاتێکا، لەو جۆرە خوێندنەوەیەدا کـەبۆ وەخـت بردنەسـەرە یـا بـۆ وەخـت کوشتنە، ڕێی تێ ئەچێ هەر لـەپاش ماوەیـەکی زۆرکـەم نـاوی نووسـەرەکەو نـاوەڕۆکی کتێبەکـەی لـەبیر بـچنەوە، لـەو خوێندنەوەیـەدا کەبەسـەرنج و لێکۆڵینەوەوەیەهەسـت ئەکـەین بـەوەی کەبەشـدارین لەگـەڵ دانەرەکەدا، لەگەڵیان ڕەنج ئەدەین و مێشکمان خەریك ئەکەین. ئـەو وەختـە پێویـستە لەتـەك خوێندنـەوەدا، ئـەو سـەرنجانەی بەدڵمانـەو لامـان گرنگـە بینووسینەوە، یا کورتەیەکی کتێبەکە بنووسینەوە یـا ڕای خۆمـان دەربـڕین بەرامبەر هێندێ سەرنجی دانەرەکە کەبەدڵمان نییە. لەوانەیە ئەم لایەنە بمان گەیەنێتە شتی وا نـوێ، بیرمـان لەشـتی وابـدا، کەدانـەری ئەوکتێبـەش بـۆی نەچووە بەلایا نەهاتووە.

ئەوەی بەتەنگ ئەوەوەیە کەزانیاری خۆی پەرەپێ بستێنێ، پێویـستە پـاش خوێندنەوەی هەموو وتارێکی گرنگ و کتێبێکی نوێ، پرسیار

لەخۆی بکات کە چ سوودێکی وەرگرتووە لە خوێندنەوەکەی؟ ئایا ئەو کتێبە سوودی پێ بەخشیووە؟ وەیا زانیاری نوێی بەکەڵك لە چ باسێکدایە وەئایا تێکرا ئەم کتێبە یا ئەو وتارە بەکەلکە و سوودبەخشە، نووسەرەکە سەرکەوتووە تیایا خۆ ئەگەر ئەم لایەنانەی تیادا نەبێت ئەوەدیارە کە ئەو وەختەی بەسەرمان بردووە بەفیڕۆ چووە. هیچ کتێبێکیش نیە لە سەروی ئەو تاقیکردنەوەیە بێت چونکە خووێندنەوەکان ئەبێ بۆ ئەوەبێ تا سوودی لێکدانەوە کەرەستەی زانیاریمان فراوان بکەین وەخۆمان بە بیری نوێو ڕووناکو بلیمەتانە پەروەردە بکەین، ئەگەر هەمو نووسەرێك و دانەری کتێبێك بزانێ کە کتێبەکەی بەم تاقیکردنەوەی لێکۆڵینەوەیەدا تێپەڕئەبێت ئەوە، ناچار ئەبن زۆرتر بیربکەنەوەو باشتر بنووسن و ئەوەی کەڵك بەخش نەبێت نەیخەنە بازاڕی چاپەمەنییەوە.

دەبا لێکۆڵینەوە، جێی خوێندنەوەی بێ ئامانج بگرێتەوەو، ببێ بە ڕەوشتێ کە بیرو هۆشی خۆمانی پێ بەرزبکەینەوە، یا خۆمان پەروەردەکەین بە خوێندنێکی هێمنی قووڵەوە، وەئامانجێکی بۆ دابنێین بۆئەوەی زانیاریو لێکدانەوەمان هەر لە گۆڕینو دەوڵەمەندبوونو تازەکردنەوەدا بێ، پێشینان ڕاستیان وتووە، کە باشترین هاوڕێی مرۆڤ کتێبە، چونکە لەچەند لاپەڕەیەکدا جیهانێکی نوێو بەسەرهاتێکی خۆشمان بۆ ئەگێڕنەوە، بە میللەتانی بێگانەمان ئەناسێنێ یا باسی ڕابوردوویەکی دێرینمان بە شێوەیەکی دڵ ڕاکێشەر ڕوون ئەکاتەوە. دەبا لەم هاوڕێیە بێبەش نەبین و وە هەمیشە هەوڵ بدەین کە لە ناویانا هاوڕێیەکی باش و سوودبەخش هەڵبژێرین. ئەمەش شتێکی زەحمەت نییە ئەگەر هەر لە ئێستاوە کە قوتابیت خۆتی پێ ڕابێنی، خوێندنەوەکەت بە لێکۆڵینەوەو سەرنج لێدانەوە بێت.

# گەشتێك بەهاوینە هەوارەكانی كوردستاندا

كوردستانی عێراق سەراپای هاوینەهەوارێكی ڕەنگین و ڕازاوەیە بەكێكی دڵـڕفێن قەشـەنگی سروشـتییە لەچوارچـێوەی كۆمـاری عێراقـدا، میـوان و گەشـتیار و گەڕیـدە لەبـەهارا ڕووبكاتــە هەرلایــەكی ئــەم هاوینــە هــەوارە پانوبەرینە دارستانی چڕو لووتكەی بەرزی بەفرینی وچیای سـەخت دەبینـێ وتافـەتاف و هاژەهـاژی ڕووبـار چـۆم و كانیـاو ئـارەزووی بیـستنی مەسـت دەكـات، ڕووەو هـەر ڕێگەیـەك بـڕوات لەهەردووبـەری ڕێگەكـە بـستێك زەوی ڕووتەن بەدیناكات، سەوزەگیاو سەدان جۆرو ڕەنگ گوڵی كێوی ئەو دەشـت و قـەدپاڵی كەژانـەیان وەك بـەرگی بـووكی لادێ ڕازاندۆتـەوە هـۆش و بـیری هەستیار دەبزوێنێ وهەزاران دڵ ئاواتە خوازی ساتێك ژیانە تیایا.

بەڵام ئەوەی جێگەی داخە ئـەم بەهەشـتە سروشـت كـردەی نەتـەوەی كـورد بێدەستكاری و بێ ئارایشتە وئەوەندەی پێویست بێت بایەخی پێ نـەدراوە، ئەگەرئەم وڵاتە نەخرایەتە پشت گوێ وپێ شێل نەكرایە ئەمان دی بەهەزاران گەشتیارو گەڕیدە لەهەموولایەكی ئەم جیهانەوە ڕوویان دەكردە ئـەم وڵاتـەو هەمووگـەلانیش زۆرلەئێـستا باشـتر لەكێـشەی كـورد دەگەیـشتن و بەچـاوی خۆیان دەیان دی ئەم كوردستانە چ وڵاتێكی جوانو بـەپیتو چ نەتەوەیـەكی دلێروئاشتی خوازو دیموكراتی پەروەر و دۆست بەگەلانی تیادەژی.

هەرچەندە ئەم وڵاتەی ئێمە یـەك هاوینـە هـەواری فراوانـە، بـەڵام باگەشـتێك بكەین بەهەندێ لەو شوێنانەدا كەتاكو ئێستا گەشتیار توانیویەتی بیگاتێ.

ئەگـەر لەناوچـەی بادینانـەوە بكەوینـەڕێ، لەشـاری دهۆكـەوە كەمەڵبەنـدی پارێزگەی دهۆكەو حەفتاوسێ كیاۆمەتر لەشـاری موسـڵەوە دوورە، دەبینـین ئـەم شـارە هـەرخۆی هاوینـە هـەوارێكی خۆشوسـازگارو میـوەدارو خـاوەن

شوێنی دیدەنییە، ئەگەرلێرەوە ڕووبکەینە شاری (ئامێدی) تادەگەینە ئەوێ چەندان هاوینەهەوار دێتە ڕێگەمان، هەرلەشار دەرچووین پاش ماوەیەك دەگەینە (زاویتە) کە نەوەد کیلۆمەتر لەشاری موسڵەوە دوورەو پلەی گەرمای لە ٢٨ پلەی سەدی تێپەڕناکات هاوینە هەوارێکی فێنك وپڕ لەدارستانی سنەوبەرە، شوێنی حەوانەوەی میوانی تیایە.

## پێرست